# ڕەجماندنا سوڕەیایرْ

---

وەرگێڕان ژ ئینگلیزی

دیان جەمیل

ب ناڤێ خودایێ مەزن و دلۆڤان

# ڕەجماندنا سوڕەیایێ

رۆمان

فەرەیدوون ساحیب جەم


- ناڤێ پەرتووکێ ب فڕەنسی (زمانێ ڕەسەن): *La Femme Lapidée*
- ناڤێ پەرتووکێ ب ئینگلیزی: .The stoning of Soraya M
- وەرگێڕان بۆ ئینگلیزی: ڕیچارد سیڤەر
- وەرگێڕان ژ ئینگلیزی: دیان جەمیل
- پێداچوونا زمانی: مسلم عسمەت
- دیزاینا بەرگی: فەرسەت زوبێر
- دیزاینا ناڤەرۆکێ: دیان جەمیل
- تیراژ: 500 دانە
- بها: 5000 دینار

ل ڕێڤەبەریا کتێبخانێن گشتی ل پارێزگەها دهۆکێ ژمارا سپاردنێ 2156 یا سالا 2016 پێ هاتیەدان

<u>رۆمان</u>

فەرەیدوون ساحیب جەم

# ڕەجماندنا سوڕەیاییڕ

وەرگێڕان ژ ئینگلیزی

دیان جەمیل

وەکی کەسێن دووڕوو نەبە

ئەوێن هزر دکەن دێ پیلانێن خوە ب گوتنێن خودایی ڤەشێرن

حافزێ شیرازی

# چەوا ئەڤ ڕۆمانە هاتە نڤیسین؟

ئەڤ ڕۆمانە ب درێژاهی بەحسێ سەرهاتیا ڕەجماندنا ژنەکێ دکەت کو ئێکە ژ هزارەها ڕوودانێن ڕەجماندنێ یێن کو د هەیاما چەند سالێن بوری دا ل ئیرانێ پشتی کەفتا شاهی ڕوودایین و دەست ب سەرداگرتنا کورسیکا دەستهەلاتێ ژ لایێ ڕژێما توندڕەو ب سەرۆکاتیا ئایەتوللاهـ خومەینی ل شواتا 1979ێ. ل وی دەمی هژمارەکا مەزن یا تاوانباران ژ زیندانان هاتنە ئازادکرن کو بەری هینگێ تاوانێن مەزن ل سەر دەمێ شاهی ئەنجامدابوون و هاتبوونە دادگەهکرن و سزادان.

هندەك ژ ڤان تاوانباران ئەو بوون یێن ب سەرڤە سەرڤە خوە ب کەسێن دیندار ددانە نیاسین و ناسناڤێ مەلاتیێ ددانا سەر خوە و ل چەندین باژێر و دەڤەران دگەڕیان داکو خوە زەنگین بکەن و ڕابردوویێ خوە یێ ڕەش بڤەشێرن. باشترین نموونە ژی ل سەر ڤان جۆرە کەسان، مەلا حەسەن بوو یێ کو د ڤێ ڕۆمانێ دا ب درێژاهی دێ بەحسێ ژیانا وی کەین و کا چەوا ڕۆلەکێ کاریگەر هەبوو ل سەر ڕەجماندنا سوڕەیایێ.

من دڤێت پیچەك بەرەڤ پاش ڤە بزڤڕین داکو بۆ هەوە بەحسێ سەرهاتیا خوە بکەم کا چەوا ژ نیشکەکێ ڤە ئەز ب سەر ڕوودانا ڕەجماندانا سوڕەیایێ هەلبووم.

ئەز کەسەکێ ئیرانی مە ل وەلاتێ فڕەنسا هاتیمە سەر دونیایێ و چەندین سالێن ژیانا خوە ل فڕەنسا و پاشی ل سویسرا بوراندینە چونکی بابێ من یەك ژ کەسێن دەستووردایی یێن ئیرانی بوو ئەوێن دگەل ڕێکخراوا کۆمەلا گەلان کاردکری. هەتا ژیێ من نەبوویە بیست سال، دەلیڤە بۆ من پەیدا نەببوو سەرەدانا وەلاتێ خوە یێ ڕەسەن بکەم.

دەمێ ئەز ڤەگەڕیایمە ئیرانێ، چوار سالێن خوە من د خزمەتا لەشکەری دا بوراندن و پاشی من خوە فێری زمانێ فڕەنسی ل پەیمانگەها فڕەنسی - ئیرانی ل تەهرانێ کر و ل دووڤ دا چوومە کۆمەلا ئەمریکی - ئیرانی و خوە فێری زمانێ ئینگلیزی کر. هەر ژ سالا 1958ێ هەتا 1966ێ من وەك هنارتیەکێ دبلۆماسی یێ ئیرانی کاردکر و پاشی بۆ مە نڤیسەر و ڕۆژنامەڤان و چەندین بابەت د گۆڤار و ڕۆژنامەیێن فڕەنسی و ئیرانی دا بەلاڤ کرن.

هەرچەندە من و خێزانا خوە پەیوەندییێن باش دگەل خێزانا شاهی هەبوون، لێ د سالێن حەفتێیان دا ژ چەرخێ بوری من هندەك گوتار نڤیسان و تێدا ڕەخنە ل شاهی گرت ب تایبەت ژ لایێ پێشیلکرنا مافێن مرۆڤی ڤە. ئەڤ گوتارە بوونە ئەگەر دەزگەهێ ڕاگەهاندنا ئیرانێ یا ناڤدار ب "ساڤاك" دژاتییا من بکەت، چونکی پۆلیسێن نهێنی یێن شاهی دژی هەر ڕەخنەکا سیاسی یا دژی شاهی بوون.

ل دوماهیا سالا 1978ێ، ئانکو ب چەند هەیڤەکێن کێم بەری ئایەتوللاهـ خومەینی بهێتە سەر کورسیکا دەستهەلاتێ، من گوتارەك د ڕۆژنامەیا "لۆمۆند" یا فرەنسی دا بەلاڤکرن ب ناڤێ "نە مارکسی و نە موحەمەد" و تێدا من گەلێ خوە ژ پەیدابوونا دوو مەترسیان هشیارکر:

حەزا ڕوسیا ژبۆ خوەشکرنا بەر پێن خوە دناڤ وەلاتی دا تاکو بشێت خوە بگەهینتە باشوورێ وەلاتی ب تایبەت دەڤەرا کەنداڤێ فارسی، هەلبەت ئەڤ حەزا ڕوسیا ژی نە تشتەکێ نوو بوو بەلکو هەر ژ سەردەمێ بەری پەیدابوونا شیوعیەتێ هەبوو. هەردیسان وان بزاڤ و پیلانێن زەلامێن ئایینی یێن شیعە ددانان ژ پێخەمەت ئێخستنا ڕژێما شاهی و گوهۆڕینا وێ ب دەستهەلاتەکا ئایینی یا توندڕەو ب هاریکاری و پشتەڤانیا وەلاتێن ڕۆژئاڤایی.

ل ڕۆژا شەمبی ڕێکەفتی 12ی گۆلانا 1979ێ، دەمێ ئەز ژ شوقەیا خوە یا ئاکنجیبوونێ ل تاخێ "نویلی" ل باژێرێ پاریس دەرکەفتیم کو من ل بەر بوو سەرەدانا هندەك هەڤالێن خوە بکەم، ترۆمبێلەك ل بەر سینگێ من ڕاوەستیا و چوار زەلام ژێ هاتنە دەرێ و ب دارێ هێزێ ئەز هاڤێتمە د پشتا ترۆمبێلێ دا و هەر یەکسەر دەستێن من گرێدان و ب کەرستەیێ کلۆروفۆرمی بێهۆش کرم. دەمێ ئەز هۆشیار بوویم، من دیت ئەز یێ ل ڤاتێ بن ئەردی یێ ئاڤاهیەکی کو پشتی هینگێ من زانی ئەو ڤات جهێ دەستەیا ئیتالی بوو دناڤا ئاڤاهیێ زانکۆیا سایت دا ل پاریس، ل

دورماندوری من کۆمەکا قوتابیێن ئیرانی یێن تۆڕە هەبوون کو ب دەنگەکێ بلند ل من دکرنە هەوار و ئاخفتنێن نەجوان دگوتنە من.

ئەز ل سەر کورسیکەکێ یێ گرێدایی بووم و ل بەرامبەر من ژی مێزەك هاتبوو دانان و مایکرۆفۆن و ئامیرەکێ تۆمارکرنێ ل سەر د دانایی بوون. ئەز یەکەم قوربانیێ دادگەهێن ئیسلامی یێن نهێنی بووم ل پاریسێ، ئەڤە ژی وەکی یەك ژ سەدان وان دادگەهێن نهێنی بوو یێن پشتی هاتنا خومەینی ل هەیڤا شواتێ ل ئیرانێ هاتینە دامەزراندن. ئەڤە ئەو دادگەهـ بوون یێن پشتی چەند دەمژمێرەکان ژ دادگەهکرنا کەسێن گۆمانلێکری هەر یەکسەر فرێدکرنە زیندانان یان ژی ب گوللەیان دهاتنە کوشتن.

بەری ڕەڤاندنا من ب سەد ڕۆژان و ب هەمان شێوە، نێزیکی هەشت سەد وەزیر و ئەندام پەرلەمان و پۆلیس و هزرمەند و زانا و هەڤالێن نێزیك یێن خێزانا شاهی هاتبوونە ڕەڤاندن و کوشتن ژبەرکو ناڤێن وان دناڤ لیستا دوژمنێن وەلاتی و شۆڕشا ئیسلامی دا بوون. ژبەرکو ئەز ب تنێ ڕۆژنامەڤان بووم، ناڤێ من دگەل وێ لیستێ نەبوو.

هەرچەندە بەری دەمەکێ کێم ژ کەفتنا شاهی ل هەیڤا کانونا دووێ من دیدارەکا ڕۆژنامەڤانی دگەل وی ئەنجامدابوو، ل دووڤ دا چەندین دیدارێن دی ل مسرێ و مەغربێ من دگەل ئەنجامدان وەك تەمامکەرێن دیدارا

یەکێ. دبیت ئەز یەکەم ڕۆژنامەڤان بم پشتی کەفتنا شاهی من دیدارەکا ڕۆژنامەڤانی دگەل ئەنجامدابیت.

من گوتارێن خوە د نێزیکی بیست ڕۆژنامە و گۆڤارێن جودا جودا دا بەلاڤ دکرن، ژبەر هندێ ئەز دهاتمە گازیکرن ژ لایێ چەندین ڕادیۆ و تێلەڤزیۆنان ڤە بۆ پشکداریکرنێ د بەرنامەیێن دانوستاندنێن سیاسی دا داکو گەنگەشەیێ ل سەر دوماهیك کاودانێن سیاسی یێن ئیرانێ بکەین. چ پێنەڤیت ئەڤ کارێ من یێ ڕۆژنامەڤانی، زێدەباری گوتارێن من د ڕۆژنامەیا "لۆمۆند" دا کو ببوونە ئەگەرێ تۆڕەکرنا بالیۆزخانەیا ئیرانێ ل فرەنسا و وان دەست ل پشت ڕەڤاندنا من هەبوو.

دادگەهکرنا من بۆ هەیاما هەشت دەمژمێران ڤەکێشا و د ڤی ماوەیی دا چەندین پرسیار ژ من هاتنە کرن و بەردەوام ئەز دهاتمە ئێشاندن و قوتان، هەروەسا چەندین تومەتێن بێ بنەما بۆ من دروست دکرن وەك: ئەز کەسەکێ سیخۆڕم و ئەندامەکم ژ پۆلیسێن نهێنی یێن شاهی و دگەل دەزگەهێ "ساڤاك" کاردکەم.

خۆشبەختانە ل دوماهیێ پۆلیس د هەوارا من هاتن و ئەز ڕزگارکرم، لێ ب ڕاستی ژی وان ئەز گەلەك قوتابووم تا وی ڕادەی چەندین دەرز د قەرقودەیێ سەرێ من دا پەیدابببوون و هەشت ددانێن من هاتبوونە شکاندن چونکی ب درێژاهیا وان هەشت دەمژمێران ئەز ڕازی نەدبووم چ

ڕاستیان ئاشکەرا بکەم یان پەسنا خومەینی و شۆڕەشا وی بکەم و بهاڤێژمە شاهی.

پشتی هینگێ چیرۆکا ڕەڤاندن و ئەشکەنجەدانا من، چەندین ڕۆژان بوو مانشێتێ لاپەڕێ دەستپێکێ یێ ڕۆژنامە و گۆڤاران، نە ب تنێ ل فرەنسا بەلکو ل ئەلمانیا و سویسرا و ئینگلتەرا و ئیتالیا ژی. ڤێ چەندێ پتر ئەز ناڤدار کرم، هەروەسا بوو ئەگەر ئەز بڕیارێ بدەم کو ئێدی پتر د پەرتووکێن خوە یێن داهاتی دا ڕۆناهیێ بێخمە سەر لایەنێ سیاسی.

ل وی دەمی یا ل سەر من پێدڤی بوو ئەز هەڤڕکیێ دگەل کەتوارەکێ نوو بکەم ژبەرکو ل تەهرانێ بێی ئامادەبوونا من ل دادگەهێ، بڕیارا سێدارەدانێ بۆ من دەرێخست چونکی ب دیتنا وان من خوە ل سنوورێن خودایێ مەزن دایە و ڕێز ل پیرۆزیا خومەینی نەگرتیە. ئەڤ چەندە بوو ئەگەر بۆ ماوەیێ چوار سالێن ل دووڤ دا خوە بڤەشێرم و ژ خێزان و کەسوکارێن خوە دووربکەڤم و ب ناسنامەیەکا نوو خوە بدەمە نیاسین. ئێدی تا ڕادەکی ئەز د چاڤێن تەهران و نوێنەرێن وێ دا ل دەرڤەی وەلاتی هاتمە ژبیرکرن، لێ د هەمان دەم دا ئەز ببوومە زەلامەکێ بێ ڕەگەزنامە و پەنابەرەکێ سیاسی یێ بێ ناسنامە.

سەرەڕای ڤێ چەندێ هەمیێ، دوو جاران ب دزیکی ڤە و ب ناسنامەیێن سەختە من سەرەدانا تەهرانێ کربوو بێی کو کەسەك گۆمانێ ژ من ببەت،

جارا یەکێ ل سالا 1981ێ بوو، جارا دی ژی پشتی هینگێ بوو ب سالەکێ. ئەگەرێ سەرەکی یێ ڤان سەرەدانێن نهێنی ژی بۆ هندێ بوو داکو ب چاڤێن خوە ڕاستیا کەتواری بزانم کا ب دروستاهی چ ل وێرێ ڕوودەدت.

د گەڕیانا خوە یا دووێ دا، ئەز بوومە یەکەم ڕۆژنامەڤان کو دیارکری دەستهەلاتدارێ نوو یێن ئیرانێ زارۆکێن ژییێ وان دناڤبەرا دوازدە بۆ چواردە سالییێ دا چەکدار دکەت و دهنێریتە بەروکێن شەڕی دژی عیراقێ. من ب چاڤێن خوە چەندین زارۆك ل بەروکێن شەڕی ددیتن دەمێ دوماهیك هەناسەیێن خوە یێن ژیانێ دهەلکێشاین.

ل ڤێرێ من پەرتووکا خوە یا ب ناڤێ "ڕۆندکێن گرییێ ب دوماهی هاتن" بەلاڤکر کو بەحسێ زارۆکەکێ چواردە سالی دکەت کو ناڤێ وی ڕەزا بوو، دایکا وی ئەو فروتبوو لەشکەرێ ئیرانێ داکو ژیانا خوە بۆ خودایێ مەزن و ئیمام خومەینی بکەتە قوربان.

د هەیاما دەهـ سالێن پشتی هینگێ دا، نێزیکی حەفت جارێن دی ئەز چوومە ئیرانێ داکو ژ نێزیك من ئاگەهـ ژ ڕەوشا خەلکی هەبیت. دوو جاران ئەز هاتمە گرتن و ڕەنگە ئەز هاتبامە سێدارەدان (بەلکو یا پێدڤی بوو ئەز بهێمە سێدارەدان ژبەر وی کارێ من دکری)، لێ هەردوو جاران ژی ئەز شیام ب بەرتیلان خوە ڕزگار بکەم. ل ئیرانێ، هەمی تشتان بهایێ خوە

هەیە ب تنێ ئەگەر تە شیانێن دانوستاندن و گرێدانا گرێبەستان هەبیت و ب پارە پشتەڤانیا گوتنێن خوە بکەی.

یەك ژ ڤان سەرەدانێن من ل پاییزا سالا 1986ێ بوو دەمێ حەفتینامەیا "پاریس ماچ" ئەز ڕاسپاردیم دووڤچوونەکێ بۆ وان ڕادارێن هەیڤێن دەستکرد و ئێزگەهێن گوهداریکرنێ بکەم یێن ل سەر سنوورێن دناڤبەرا ئیران و پاکستان و ئەفغانستانێ دا هاتینە دانان. د گەڕیانا خوە دا بۆ ڤان ئێزگەهان، ئەز گەهشتمە گوندەکێ بچووك کو نێزیکی سنوورێ پاکستانێ بوو. ئەز دگەل دوو کەسێن ناڤخۆیی ڕێکەفتبووم ب شێوەیەکێ نهێنی من بگەهیننە سەر سنووری، لێ ژبەرکو ب چەند دەمژمێرەکان بەری ژڤانێ خوە یێ دەستنیشانکری ئەم گەهشتینە وێرێ ژبەر هندێ ئەم ماینە ل وی گوندی.

من بزاڤ دکر وەکی کەسەکێ ئاسایی خۆیا بکەم لێ ژبەرکو من جلکێن ئیرانی یێن کلاسیکی کربوونە بەر خوە، هەر زوو خەلکی زانی ئەز نە گوندیێ وانم. هەر ل وی دەمی پیرەژنەکا پیر دناڤ باخچەیێ مالا خوە دا یا ڕوونشتی بوو، داخواز ژ من کر بچمە دەڤ وێ و چایەکێ ڤەخۆم. ناڤێ ڤێ پیرەژنێ "زەهرا"بوو کو د ڤێ ڕۆمانێ دا دێ باشتر وێ نیاسن. دگوتنە ڤی گوندی "کوپایێ" ئەوێ ڕوودانێن سەرەکی یێن چیرۆکا ڤێ ڕۆمانێ تێدا ڕوودایین، ژبەر هندێ من هەمی بزاڤ کرن ئەز ناڤ و جهێ گوندی باش ژبەر بکەم.

پشتی ڤەخوارنا گلاسەکا چایێ، وێ پیرەژنێ گوتە من کو خوارزایا وێ ئەوا د ژیێ سیه‌ و پێنچ سالیێ دا ب ناڤێ "سوڕەیا"، وەغەرا دوماهیێ کریە. ئەگەر بەری دوو حەفتیان ئەز ل وی گوندی بام، دا ب چاڤێن خوە ڕوودانەکا دلتەزین و ب ترس بینم ئەوژی ڕەجماندنا سوڕەیایێ بوو هەتا گیانێ خوە ژدەسدایی چونکی خیانەت ل هەڤژینێ خوە کربوو. دەمێ وێ ئەڤ سەرهاتیە بۆ من ڤەدگێڕای، دەستێن وێ دلەرزین و دترسیا، لێ یا نەخۆش ئەوبوو کو سوڕەیا ژنەکا بێگونەه‌ بوو و چ شاشی ل هەمبەر هەڤژینێ خوە نەکربوون.

چیرۆکا ڕەجماندنا سوڕەیایێ بۆ من گەلەك یا بالکێش بوو ژبەر هندێ من داخواز ژ خالەتا وێ کر بەرفرەهتر بەحسێ ڤێ ڕوودانێ بکەت. دەمێ وێ بەحسێ سەرهاتیێ دکری، ڕێنیشاندەرێن من هاتنە د دووڤ من ڕا ژبەر هندێ من سوز دا زەهرایێ جارەکا دی سەرەدانا وێ بکەم بەری ژ ئیرانێ بدەرکەڤم، من ژڤانەك دگەل دانا ئەوژی دوو ڕۆژان پشتی سەرسالا ئیرانی یا نوو بوو کو دبوو 23یێ ئادارا 1987ێ.

دووبارە د ژڤانێ دەستینشانکری دا ئەز زڤڕیمە گوندی و زەهرایێ هۆسا بۆ گوندیان دا دیارکرن کو ئەز کوڕێ خوشکا وێ مە و ل ناڤ باژێری دژیم و ژبۆ بوراندنا بێهنڤەدانێ هاتیمە دەڤ وێ. د وی هەیاما ئەز مایمە ل گوندی دا، وێ چیرۆکا سوڕەیایێ ب تەمامی بۆ من ڤەگێڕا، هەر ژ زارۆکینیا وێ هەتا ڕۆژا ڕەجماندنا وێ.

کوپایێ گوندەکێ بچووك بوو ژ هزاران گوندێن ئیرانێ و نێزیکی 250 کەسان لێ دژیان. ل دەوروبەری ڤی گوندی دارستان و باخ و ڕەز هەنە و ڕووبارەکێ پاقژ و ڕۆهن ژ چیایێ وی دزێت و ب ڕەخ گوندی ڕا دبوریت. هەر ب ڕێکا زەهرایێ، من پتریا کەسایەیێن پشکدار د ڤێ چیرۆکێ دا ل ناڤ گوندی دیتن وەك باب و هەڤژین و زارۆك و هەڤسوویێن وێ و موختارێ گوندی.

زەهرایێ بەرسڤا هەمی وان پرسیاران ددا یێن د سەرێ من دا پەیدادبووین داکو چیرۆکا ڕەجماندنا خوارزایا وێ ب شێوەیەکێ تێروتەسەل و ڕاستەقینە ل دەڤ خوە تۆمار بکەم. لێ کەسێ یەکانە یێ من نەدیتی مەلا حەسەن بوو چونکی ل وی دەمی چووبوو ژ دەرڤەی گوندی.

ل وی دەمی کو نێزیکی شەش هەیڤان ب سەر ڤێ ڕوودانا دلتەزین ڤە بوری بوون، هۆسا دیاربوو خەلکێ گوندی خەلکەکێ خۆدان ڕێز بوو و ب تەمامی ئەو تاوانا ب کۆم دژی سوڕەیایێ ژبیرکربوو. سەرەڕای هەمی تشتان، لێ ڕژێما ئایەتوللاهـ خومەینی پشتەڤانیا وان دکر سزایێ ڕەجماندنێ نوو بکەنەڤە ژبۆ پاقژکرنا نامووسا گوندێ خوە هەروەکو سەدان گوندێن دی یێن ئەڤ کارە ب ناڤێ خودایی ئەنجام ددایی.

دەمێ ل دوماهیا هەیڤا ئادارێ من خاترا خوە ژ زەهرایێ خواستی، من زانی ئەز ئێدی جارەکا دی وێ نابینمەڤە، ڤێ ڕوودانێ کارتێکرنەکا مەزن

ل سەر وێ كربوو ژبەر هندێ وێ ژی دەست ژ هەمی تشتان بەردابوون و بەرەڤ مرنا خوە دكرە غار، پشتی هینگێ ب دوو سالان وێ وەغەركر لێ من گوهـ ل دەنگوباسێ مرنا وێ نەبوو تاكو دەمەكێ درێژ بوری و ئەز زڤریمە ئەوروٚپا ڤە.

ل وەلاتێن ئایینی ب ئاوایەكێ فەرمی سزایێ ڕەجماندنێ هاتیە قەدەغەكرن، لێ هەر دەستهەلاتەكا ئیسلامی ئەگەر بڤێت ڤی سزایی بجهـ بینیت، دشێت پێشنیار بكەت.

دەمێ حەجی دچنە حەجێ ل مەككەهێ، ل ڕوٚژا دوماهیێ ل سەرێ چیایێ عەرەفێ دڕاوەستن و ل بەرامبەری وان سێ ستوونێن بلند هەنە كو وەك هێمایەكی نە بوٚ ئەهریمەنی و خەلك بەران تێوەر دكەن، ژبەر هندێ ئەو ژنا خیانەتێ ژی ل هەڤژینێ خوە دكەت وەك ئەهریمەن دهێتە هەژمارتن لەوڕا سزایێ ڕەجماندنێ ل سەر دهێتە سەپاندن.

ل باژێرێن مەزن كو تاوانبار تێدا دهێنە سێدارەدان، سزایێ ڕەجماندنێ ناهێتە بجهئینان، بەلكو ڕەجماندن ب تنێ ل هندەك دەڤەرێن دوور و چیایی دهێتە بجهئینان، پشتی ئەو ڤی كاری دكەن ژی شانازیێ ب خوە دبەن و دەستخوٚشی ژ لایێ دەستهەلاتدارێن بلند یێن وەلاتی ڤە ل وان دهێتە كرن.

ل باژێران، ئەو ژنێن ب تومەتا زنایێ دهێنە گونەهبارکرن، دشێن ل خوە بزڤرن و تۆبە بکەن ئەوژی پشتی کو کوژمەکێ پارەیی ددەنە زەلامەکێ ئایینی و خوە ڕزگار بکەن. ئەگەر ئەڤ ژنە د دەولەمەند بن، دێ شێنە هەڤژینێن خوە، لێ پتریا جاران ئەڤ ژنە د هەژارن و پارە نینن زەلامێن ئایینی پێ ڕازی بکەن ژبەر هندێ دبنە خزمەتکارێن زەلامێن خوە و چ ماف نینن ژ بێدەنگبوونێ زێدەتر.

زەلام پێدڤی ب دوو دیدەڤانایە داکو تاوانا هەڤژینا خوە بسەلمینیت و گەلەگ جاران ئەڤ هەردوو دیدەڤانە ژی هەر هەڤالێن زەلامی نە یان کرێگرتییێن وی نە داکو د بەرژەوەندیا وی دا باخڤن، ل ڤێرێ ل سەر ژنێ یا پێدڤییە بێگونەهیا خوە دیار بکەت و هەلبەت ئەڤ چەندە ژی تشتەکێ دەگمەنە چونکی کەس یێ ئامادە نینە بێ بەرامبەر د بەرژەوەندیا وێ دا شەهدەییێ بدەت.

ژبەر ڤان ئەگەران، گەلەك یا ب زەحمەتە مرۆڤ ئامار و سەرژمێرییێن هوور ل دور سزایێ ڕەجماندنێ ب دەستخوەڤە بینیت. هەرچەندە حکومەتا ئیرانێ دابوو دیارکرن کو د ماوەیێ پێنج سالێن دەستپێکێ یێن دەستهەلاتا ئیسلامی دا ئانکو ژ 1979ێ هەتا 1983ێ، ژ پێنج سەد هەتا شەش سەد ژنان هاتینە ڕەجماندن، لێ ئەگەر ئەم ل دووڤ بەلگەنامەیێن زێدەتر بچین وەك لیژنەیا مافێن مرۆڤی یا سەر ب نەتەوەیێن یەکگرتی ڤە و ڕێکخراوا لێبورینا نێڤدەولەتی و ڕێکخراوا خاچا سۆر و ڕابیتەیا مافێن مرۆڤی و

هژمارەكا ڕێكخراوێن ژنان، دێ بۆ مە دیاربیت كو د هەیاما پازدە سالێن دەستپێكێ یێن دەستهەلاتا ئیسلامی دا ل ئیرانێ، پتر ژ هزار ژنان هاتینە ڕەجماندن و یەك ژ دڕندەترین ڤان ڕوودانان ل هەیڤا كانوونا دووێ یا سالا 1992ێ هاتیە ئەنجامدان ل باژێرەكی ب ناڤێ "كەرەج" كو نێزیكی 25 میلان ژ تەهرانێ یێ دوورە.

ل سەر دەمێ ئەڤرۆ، ئیران هۆسا خوە دیاردكەت كو سزایێن ڕەجماندن و سێدارەدانێ زوو ب زوو ئەنجام نادەت ژ پێخەمەت هندێ وێنەیێ خوە ل هەمبەر جیهانێ باش بكەت لێ ڕاستیا تەحل ئەوە كو هێشتا ئەڤ سزایێ دڕندە ل گەلەك جهێن وەلاتی دهێتە بجهئینان.

فەرەیدوون ساحیب جەم

# بەشێ یەکێ

ل باشوورێ ڕۆژهەلاتێ ئیرانێ ب دووراتییا نێزیکی 35 میلان ژ باژێرێ کرمان، گوندەکێ بچووك هەیە دبێژنێ "کوپایێ" کو ڕامانا وێ د زمانێ فارسی دا ئانکو "بنارێ چیایی"، ژبەرکو ئەڤ گوندە دکەڤیتە بنێ چیایەکی لەوڕا ب ڤی ناڤی هاتیە ناڤکرن. د ڤی گوندی دا هژمارەکا کێم یا خانیان هەنە کو ب تابۆکێن ئاخێ و کایێ هاتینە ئاڤاکرن. ل لایەکێ ڤی گوندی ڕووبارەکێ ئاڤێ هەیە و ل لایێ دی دارستانەکا پڕی دارێن چنار و بەڕی و زەیتینان لێ هەیە و ل پشتا وی ژی ڕەز و بیستانێن بەرفرەهـ یێن گوندیان لێ هەنە و هندەك جاران پەز و چێلێن خوە لێ دچەرینن.

کوبایێ نە ژ وان گوندایە یێن تو ب سانەهی دگەهییێ ژبەرکو ڕێکا چوونا وێ گەلەك یا ئاسێ و ئالۆزە، لەوڕا پێدڤیە تو ب وێ ڕێکا یەکانە بچی ئەوا بەرەڤ سەرێ چیایی دچیت کو ڕێکەکا زێدە ئاسێ و نەخۆشە، هەروەسا هژمارەکا مەزن یا ژێهەلییێن سەخت و دژوار د ڕێکێ هەنە، کا چەند ئاخ ل سەر ڤێ ڕێکێ هەیە هند مەترسی ژی یا ل سەر ژیانا مرۆڤی هەی دەمێ تێڕا دبوریت.

سەرەڕای ڤێ مەترسیێ، هەموو حەفتیان جارەکێ کو ئەو ژی ڕۆژا بازارکرنێ یە[1]، ترۆمبێلەکا کەڤن و پرت ژێ کەفتی سپێدێ زوو خوە دگەهینتە ڤی گوندی کو هژمارەکا جووتیاران ژ گوندێن دی ژی دگەل خوە

[1] ئانکو ڕۆژا مەیدانکێ کو خەلك کەلوپەلێن خوە دئینە وێرێ و ب بهایەکێ ئەرزانتر ژ سیکێ دفرۆشن.

سوار دکەت و هەر یەکی بارەکێ تشتان دانایە سەر ملێ خوە و دڤێن بهێنە بازارێ گوندی و ڤان تشتان بفرۆشن یان هەر چ نەبیت دگەل هندەکێن دی ب گوهۆڕن.

ل ڤی گوندی، و ل سالا 1951ێ، سوڕەیا هاتە سەر دنیایێ.

ئەو ڕۆژا سوڕەیا ژدایکبووی، هەمان ئەو ڕۆژ بوو یا شاهێ ئیرانێ موحەمەد ڕەزایێ پەهلەوی ژ بۆ جارا دووێ دەهواتا خوە تێدا کری، ژبەر هندێ دایك و بابێن وێ ئەو ب ناڤێ هەڤژینا نوو یا شاهی ناڤکر و ناڤێ وێ کرە سوڕەیا. ل وێ ڕۆژێ خەلکی هەموویان ژبەر دەهواتا شاهی، کەیف و خۆشی دگێڕان.

بابێ ڤێ زارۆکا نوو ئەوێ دگوتنێ مورتەزایێ ڕەمەزانی د ژیەکێ مەزن دا ژ نوو ژیانا هەڤژینیێ پێکئینا بوو، ژبەر هندێ گەلەك یێ کەیفخۆش بوو کو خودایی زارۆکەکا کچ دایە وی، کەیفا وی هند یا مەزن بوو هەتا ب هەموو باوەریا خوە ڤە گوتی "سوڕەیا دێ بیتە جوانترین کچا گوندی و دێ وێ دەمە باشترین جحێلێ گوندی و دڤێت ئەو بهایێ وێ بزانیت."

دایکا وێ ژنەکا ئیماندار و بەلنگاز بوو دگوتنێ شەوکەت، دەمێ وێ یەکەم زارۆکێ خوە دانایی ژیێ وێ ب تنێ سێزدە سال بوون، پشتی هینگێ چوار زارۆکێن دی بوون لێ دوو ژ وان زارۆکان هێشتا د ژیێ زارۆکینیێ دا وەغەرکرن. پشتی سوڕەیا هاتیە سەر دنیایێ، دایکا وێ گەلەك نەساخ بوو لەوڕا نۆژدارەك ژ باژێرێ کرمان هاتە گوندی داکو چارەسەریا وێ بکەت.

**نۆژداری گوته هەڤژینا مورتەزای:**

**"ئەگەر جارەكا دی تو ب دووگیان بکەڤی، دێ گیانێ خوە ژ دەستدەی."**

**ئەڤێ چەندێ ڕێك ل هەمبەر بابێ سوڕەیایێ ب سانەهی کر هەڤژینەکا دی ل دووڤ شێوازێ "هەڤژینیا خۆشیێ"[2] بۆ خوە بینیت و یاسایا ئیرانێ دەلیڤە ژ بۆ ڤێ چەندێ دایە. هەڤژینا وی یا نوو ژی چوو مالا وی و دگەل هەڤژین و زارۆکێن وی د یەك خانی ڤە ژیانا و وێ ژی چوار زارۆکێن دی بۆ مورتەزای ئینانە سەر دنیایێ.**

**هەموو ئەندامێن وێ خێزانێ ب خۆشی و بەختەوەری دژیان. سەرەڕای ئینانا هەڤژینا دووێ ژی، لێ شەوکەت هەر وەکی خاتینا مالێ بوو و هەموویان گەلەك حەز ژێ دکر، کارێن دی یێن سادە و نەهند گرنگ مانە ب هیڤیا هەڤژینا مورتەزای یا دووێ ڤە و وێ ژی ئەڤ کارە بێ گازندە و نەخۆشی بڕێڤە دبرن و یا ب حالێ خوە ڕازی بوو.**

**دەمێ نەخۆشیا شەوکەتێ گران بووی و تووشی ئیفلیجیێ (شەلەلێ) بووی، هەردوو کوڕێن وێ یێن مەزن و سوڕەیایێ کاروبارێن مالێ بڕێڤە دبرن. ژبەرکو بەری هینگێ ئەو فێری خواندن و نڤیسینێ ببوون لەوڕا ئەو دشیان قورئانێ و بەلاڤۆکێن ناڤخۆیی ژ بۆ ئەندامێن دی یێن خێزانا خوە بخوینن.**

**ئەڤ زارۆکە ل قوتابخانەیا گوندی فێری خواندن و نڤیسینێ بوون، ئەو قوتابخانەیا ڕۆژانە دەرگەهێ وێ نەدهاتە ڤەکرن، ژبەرکو**

---

[2] زواج متعة

مامۆستایێ قوتابخانەیێ کارێ دروستکرنا ئامانێن تەڤنێ دکر و دەمێ هندەك جاران ب ڤی کاری ڤە یێ مژوول با یان چووبا بازاڕی داکو ئامانێن خوە بفرۆشیت، دەلیڤە ددا زارۆکان بۆ خوە دناڤ باخچەیێ قوتابخانەیێ دا یاریان بکەن.

ل ڕۆژەکا بێهنڤەدانا هاڤینێ، بۆ یەکەم جار چاڤێ سوڕەیایێ ب کوڕکەکی کەفت دگوتنێ قوربان عەلی، ل وی دەمی ژیێ سوڕەیایێ ب تنێ پێنج سال بوون و ژیێ عەلی ژی دەهـ سال بوون.

ڕۆژەکێ عەلی بڕیاردا فڕۆکەکا کاغەزی دروست بکەت، بۆ ماوەیێ چەندین دەمژمێران ئەو مژوولی بڕینا پرتێن داران و ئامادەکرنا پەڕێن ڕەنگاوڕەنگ و پێکڤە گرێدانا وان بوو، سەرەڕای ڤان بزاڤێن وی یێن بەردەوام لێ فڕۆکەیا وی هەر بلند نەبوو و نەشیا بفڕیت چونکی دارێن وێ د گران بوون و بەرپەڕێن وێ ژی دەمێ دکەفتنە بەر بای دقورمچین و هندەك جاران ژی سکوتین باش نەمابوو ب فڕۆکەیێ ڤە و هندەك جارێن دی ژی دەرزیێ فڕۆکەیێ ژێڤە دبوو.

ل دوماهیێ عەلی شیا فڕۆکەکا هۆسا دروست بکەت کو بشێت ل ئاسمانی بفڕیت و ب ڤێ چەندێ کەیفا وی گەلەك هات، هەر یەکسەر هژمارەکا زارۆکان ل دور وی خڕڤەبوون، هژمارا وان نێزیکی بیست زارۆکان یان پتر بوو و ژیێن وان ژی دناڤبەرا پێنج بۆ پازدە سالیێ دا بوون. زارۆك هەموو گەلەك کەیفخۆش بوون دەمێ وان دیتی فڕۆکە یا بلند دبیتە بەر ئاسمانی، هەستێ وان یێ بێگونەهـ ب چ ڕەنگان ناهێتە دەربڕین.

عەلی هێلا هەر بێهنەکێ زارۆکەك بەندکێ فڕۆکەیا وی بگریت و ل ئاسمانی بفڕینیت، پاشی گەڕا سوڕەیایێ هات، وێ ب شەرم ڤە خوە هێدی هێدی نێزیك کر و بەندکێ فڕۆکەیێ گرت، دەمێ زارۆکان هەموویان دەست بۆ دقوتاین و پشتەڤانیا وێ دکر، پێ سوڕەیایێ کەفتە بەر بەرەکی و ب ئەردی کەفت، بەندك ژ دەستێ وێ دەرکەفت و فڕۆکە ژی ژ دەستێ وێ چوو دەرێ و بەرەڤ ئاسمانی بلند بوو هەتا جارەکا دی هاتیە خوارێ و ل سەر چەقێن دارەکا بلند مای.

دەمێ سوڕەیا ڕابوویەڤە، پێ وێ سەلخی بوو و خوین ژێ دهات، هەڤالێن وێ ژی هەموو ڕەڤی بوون و کەس نەمابوو ل وێرێ.

پاشی سوڕەیایێ کرە غار و بەرەڤ مال ڤە چوو. دایکا وێ برینا وێ دەرمان کر و پاتەکێ پاقژ بۆ ل دور ئالاند. هێشتا دەمەکێ درێژ نەبوری بوو، سوڕەیا چوو ژ دەرڤە و پشتی چەند پێنگاڤان ژ مال دوور کەفتی، هەڤالێن وێ لێ کرنە هەوار و لومەی وێ کرن و گوتنێ:

"ئەی زارۆکا نە شارەزا، وەرە سەحکێ تە یا چ کری! مە نەڤێت جارەکا دی تو یاریان دگەل مە بکەی."

ڤێ زارۆکا بەلنگاز نەزانی دێ چەوا بەرەڤانیێ ژ خوە کەت.

پاشی عەلی لێ کرە قێژی و ب دەنگەکێ بلند گوتێ:

"وەرە سەحکێ تە یا چ ل فڕۆکەیێ کری و یا مایە ب کیرێ ڤە!"

عەلی چنگلێ وێ گرت و بەرەڤ بنێ گوندی بر و زارۆکێن دی ژی دا دووڤ وان. فڕۆکە مابوو دناڤ چەقێن دارەکا چنارێ یا گەلەك بلند ڕا کو

یا ب زەحمەت بوو کەسەك بشێت بینتە خوارێ یان بچیتە سەر دارێ و فڕۆکەیێ ژناڤ چەقێن وێ بینتە دەرێ، درێژترین پێسترکا گوندی ژی چ مفا تێدا نەبوو ژبەرکو درێژاهیا وێ ب تنێ 396.24 سانتیمەتر بوو لێ ئەڤ دارە گەلەك بلندتر بوو، هەردیسان درێژاهیا خوە یەك ژ وان ستوونێن خەلکێ گوندی ژ بۆ هەژاندنا دارێن بندەڤان ژی ب کاردئینااین تێرا هندێ نەدکر ئەو پێ فڕۆکەیا خوە بیتە خواری.

هەردیسان خوە زارۆکەك نەدشیا بچیتە سەر دارێ ژبەرکو چەقێن وێ گەلەك د نازك و لاواز بوون، چەقێن وێ هند د نازك بوون نەدشیا خوە ل بەر گرانیا زارۆکەکێ بچووك ژی بگریت. هەکە زارۆکان ڤیابا دارێ بهەژینن داکو فڕۆکەیا وان بکەڤیت، چ مفا د ڤێ بزاڤێ ژی دا نەبوو چونکی قورمێ دارێ هند یێ مەزن چ زارۆك نەدشیان بهەژینن.

ئاها ل ڤێرێ عەلی گەلەك تۆڕە بوو و گوتە سوڕەیایێ:

"دڤێت تو بۆ من فڕۆکەکا دی دروست بکەی، ئەگەر تو وەنەکەی ئێدی تو نەشێی یاریان دگەل مە بکەی".

ئەڤ بڕیارا عەلی گەلەك ب دلێ زارۆکێن دی ژی بوو لەوڕا وان دەستپێکر بەر و گومتلێن ئاخێ د سوڕەیایێ وەرکرن، وێ دەستێن خوە دانانە سەر سەرێ خوە و سەرێ خوە چەماند و خوە ل هیڤیا وان گرت هەتا ئەو ب دوماهی بهێن.

هەرچەندە وێ هەست ب نەخۆشی و خەمگینیەکا مەزن کر لێ وێ نەڤیا ل پێش چاڤێن هەڤالێن خوە بکەتە گری، ئەو بەرامبەر ڤێ چەندێ یا خۆڕاگر بوو، وێ چاڤێن خوە ب هێز نقاندن، دەمێ زانی دەنگێ

چ زارۆكان ناهێته گوهێن وێ، وێ سەرێ خوه بلند كر و چاڤێن خوه ڤەكرن دیت كەس نەمایە ل وێرێ ب تنێ كچا مامێ وێ مەعسۆما نەبیت ئەوا ب رەخ وێ ڤە روونشتی.

مەعسۆمایێ گوتێ:

"خوه نەترسینە، بەس تو بێهنا خوه فرەهـ بكە ئەز دێ هاریكارییا تە كەم و دێ فرۆكەكا گەلەك ژ وێ باشتر دروست كەین."

سورەیایێ بەرسڤ دا و گوت:

"گەلەك كەربێن من ژ عەلی ڤەدبن، كەربێن من ژێڤە دبن، من نەڤێت ئەز وی ببینمەڤە"

پشتی ڤان رووداناں، ژیانا سورەیایێ بۆ ماوەیێ چەندین سالێن ل دووڤ دا یا ڤالاٚ بوو ژ رووداننێن گرنگ و بالكێش.

دەمێ ژیێ وێ بوویە دەهـ سال بابێ وێ ئەو فرێكرە باژێرێ كرمان داكو خواندنا خوه ل وێرێ تەمام بكەت، ل باژێری ئەو چوو مالا "ئەرباب"ی كو ئاغایێ گوندی بوو. ئاغای ژبلی خانیەكێ مەزن ل باژێری، گەلەك مال و ملك ل گوندی ژی هەبوو.

ل ڤێ مالێ یا كو زارۆكان لێ دخواند، د هەمان دەم دا وان وەكی خولام و خودامان كاردكرن لێ بەرامبەر هندێ وان چ پارە نەدوەرگرتن بەلكو ب تنێ جهێ نڤستنێ و خوارنا رۆژانە ژ بۆ وان دهاتە دابینكرن. ڤان زارۆكان رۆژانە بۆ ماوەیێ پازدە دەمژمێران كاردكر بێی كو ماوەیەكێ

کورت ژی بنڤن یان یاریان بکەن، هەتا ل نیڤا شەڤێ ئەو چەندین جاران ژ خەو هشیار دبوون و هەست ب ئێشان و وەستیانا لەشێ خوە دکرن.

کەربێن سوڕەیایێ گەلەك ژ خوەدانێ مالێ یێ زەنگین ڤەدبوون، ئەو ب خوە زەلامەکێ قەلەو و سەر قژاڤژ بوو و گەلەك یێ ژ خوە ڕازی بوو، هەروەسا وی بەردەوام زارۆك دقوتان هەکە کارێ خوە باش نەکربا یان یەکی گوهێ نەدابایێ.

ئەگەر تو ژی زارۆکەکا د ژیێ سوڕەیایێ دا بای یان ل جهێ وێ بای، ما دا چەوا سەرەدەریێ دگەل زەلامەکێ هۆسا یێ ب هێز کەی ئەوێ هەموو گاڤان دەبانجەك د ترۆمبێلێ دا هەی!

هەر گاڤا سوڕەیایێ شاشیەك کربا، دا خوە بۆ وی چەمینیت و داخوازا لێبورینێ ژێ کەت و دەستێ وی ماچی کەت. وێ بۆ ماوەیێ سێ سالان خوە ل بەر ڕەزیلکرن و ئاخفتنێن وی یێن ڕەق و دەستدرێژیا وی یا سێکسی دگرت ب تایبەت دەمێ هەڤژینا وی ل مال نەبایە.

دەمێ هەڤژینا وی ب کارەکی ژ مال دەرکەفتبایە، ئەو دا گازی سوڕەیایێ کەت و بەتە د ژوورا خوە ڤە و دا هێدی هێدی جلێن وێ ژبەر کەت و دا هندەك ئاخفتنان بێژیتی کو سوڕەیا د مەرەما ڤان ئاخفتنان نەدگەهشت.

پشتی وی ئەو ڕویس دکری، دا دەستێ خوە کەتە لەشێ وێ، لێ ئەو زارۆکا بێگونەهـ د ڕامانا ڤان لڤینان نەدگەهشت و نەدزانی دێ چەوا خوە ژ دەستێن وی قورتال کەت، لێ دگەل هندێ ئەو یا نەچار بوو ل دوماهیێ سوپاسیا وی ژی بکەت پشتی کو هندەك شریناهی یان خورمە

ددایێ، دەمێ د بوویە سپێدە دا دووبارە وەکی هەموو زارۆکێن دی دەست ب کاری کەتەڤە.

بۆ ماوەیێ ڤان سێ سالان، سورەیایێ دایك و بابێن خوە نەدیتن، لێ هندەك جاران یەك ژ برایێن وێ دا هێتە باژێری و سەرا وێ ددا، ل وی دەمی ب تنێ سورەیایێ ماف هەبوو بۆ ماوەیێ چارێك دەمژمێرێ دگەل برایێ خوە دناڤ باخچەی دا ب ڕوونتە خوارێ.

یا ل سەر سورەیایێ پێدڤی بوو ئەو پەردەیا خوە یا کچینییێ بپارێزیت هەتا ئەو شوو دکەت. دەمێ وی زەلامێ قەلەو ژی یاری بۆ خوە ب لەشێ وێ دکرن گەلەك یێ ل ڤێ چەندێ هشیار بوو، ژبەرکو ئەگەر وی کارەکێ هۆسا کربایە کو وێ کچینیا خوە ژ دەستدابایە دا هەتکا وی دناڤ خەلکی دا چیت و ئەو دا یێ نەچار بیت برەکا مەزن یا پارەی بدەتە مالا کچێ،

دەستهەلاتدارێن ئیرانێ یێن وی وەختی، بەری کو شۆڕەش ل ئیرانێ پەیدابیت ب ماوەیەکێ درێژ، ئەڤ سزایە ل سەر وان کەسان دسەپاند یێن دەستدرێژیا سێکسی کربایە سەر زارۆکەکێ بێی کو ئەو چووبانە د زیندانێ ڤە یان تووشی سزایێن مەزن ببان.

هەروەسا کورێن ڤی زەلامی ژی گەلەك نەخۆشی دگەهاندنە سورەیایێ و دەستێ خوە دکرنە سنگ و پێن وێ، لێ ئەو نەدشیان تشتەکێ زێدەتر ژ ڤێ چەندێ بکەن چونکی وان دزانی بابێ وان گەلەك گرنگییێ ددەتە ڤێ کچێ و ئەگەر ئەو کارەکێ هۆسا بکەن دوور نینە بابێ وان سزایەکێ مەزن بدانیتە بەر وان.

ڕۆژەکێ بابێ وان شەڤەکا حێل دانا کوڕەکی خوە دەمێ چوویە د ژوور ڤە و ب چاڤێن خوە دیتی کوڕێ وی یێ دەستێ خوە دکەتە سوڕەیایێ و خوە نێزیکی وێ دکەت، ل وی دەمی سوڕەیا گەلەك ترسیا و هەر یەکسەر ژ وێ ژوورێ دەرکەفت و خوە دناڤ کونجەکا مالێ دا ڤەشارت.

پشتی بورینا حەفتیەکێ ژ ڤێ ڕوودانێ، سوڕەیا جارەکا دی زڤڕی گوندێ خوە داکو هەتا هەتایێ ل وێرێ بژیت. ل وی دەمی ژیێ سوڕەیایێ ژ سێزدە سالان بوری بوو و کچەکا گەلەك جوان و بالکێش ژێ پەیدابوو. بابێ وێ بڕیار دا وێ بدەتە عەلی کو ژیێ وی ژی گەهشتبوو نێزیکی بیست سالان.

دەمێ جارەکا دی چاڤێ عەلی ب سوڕەیایێ کەفتی، وی ئەو نەنیاسی، لێ ل وێ ڕۆژێ بۆ یەکەم جار وی هەست ب زەلامینیا خوە کر ژبەرکو بەری هینگێ وی چ سەربورێن ئەڤینیێ دگەل چ کچێن دی نەبوون، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی بۆ گەلەك تشتان دزڤڕی، وی بەری هینگێ چ کچێن دی یێن ل دووڤ دلێ خوە ل گوندی نەدیتبوون و ئەو چ جاران نەچووبوو باژێرێ کرمان ژی، هەروەسا وی چ پارە و سامان نەبوون ئەگەر وی جارەکێ ڤیابا کارەکێ ب دزی ڤە بکەت یان بچیتە مالا لەشفرۆشەکێ.

هەرچەندە گەلەك کچ د گوندێ کوپایێ دا هەبوون، لێ دیارە ژیێن وان گەلەك د بچووك بوون یان ژی هند د جوان نەبوون کو بشێن

دلێ عەلی بۆ خوە بکێشن یان ژی وان چ پارە نەبوون وەکو مەهر بدەنە عەلی[3].

هەر جارەکا ئاغایێ گوندی ئەوێ مالا وی ل باژێری ب سەرەدان هاتبایە گوندی، دا خەلکێ گوندی هەموو ل گوڕەپانا پێشوازیکرنێ خڕڤەبن و بخێرهاتنا وی کەن ژبەرکو ئەو خۆدانێ هەموو مال و بیستان و ڕەزێن گوندی بوو، هەتا ئەو خۆدانێ وێ ئاڤێ ژی بوو یا د ڕووبارێ گوندێ وان ڕا دهاتی.

ڤی کەسێ زەنگین زەڤیێن خوە ب کرێ ددانەڤ جووتیاران لەوڕا خەلکێ گوندی دا هێنە نك وی و دا دەستێ وی ماچی کەن و پەزەکی بۆ کەنە قوربان و دا دوعا ژ خودایی کەن وی و خێزانا وی ژ هەموو بەلاّ و نەخۆشیێن دنیایێ بپاییزیت،

ئەندامێن هەموو خێزانان هەر یەك دا چانتەکی یان سندۆقەکێ یان ئامانەکی وەك دیاری دگەل خوە بەتە وێ مالێ یا پیچەکێ ژ گوندی ڤەدەر کو مالا ئاغای بوو، ل ئێڤاریا هەمان ڕۆژ خەلکێ گوندی دا هندەك زارۆکێن دی ئیننە دەڤ ئاغای داکو ببەتە باژێری و ل دەڤ خوە بدەتە کاری و فێری خواندن و نڤیسینێ بکەت.

پشتی ماوەیەکێ کورت ژ ڤەگەڕیانا سۆڕەیایێ ژ باژێرێ کرمان، ل پاییزا سالا 1964 ئەو و عەلی لێك هاتنە مارکرن، ب ڤێ هەلکەفتێ وان

[3] هۆسا دیارە ل وی سەردەمی و ل وی گوندی دابونەریت د هۆسا بوون ئەگەر کوڕەکی ڤیابا کچەکێ بخوازیت، پێدڤی بوو ل سەر مالاّ کچێ کوژمەکێ پارەی وەکو مەهر بدەتە مالاّ کوڕی.

مەلایەك داخوازكرە گوندی و گرۆپەكێ موزیكێ یێ گەڕۆك ژی مێهڤان كرە گوندی.

خەلكی گوندی جوانترین جلك كرنە بەر خوە. زەلامان دەست ب تڕاشینا ڕهـ و سمبێلێن خوە كر، ژنان ژی جلوبەرگێن ڕەنگاوڕەنگ و زێڕێن خوە كرنە بەر خو، خەلكێ گوندی هەموو بەرەڤ گوڕەپانا نیڤەكا گوندی چوون، پشتی ماوەیەكێ كورت ئاگرەكێ مەزن هاتە هەلكرن و یاریێن ئاگری بلند بوون ئەو ژی پشتی مەلای دەست ب ڕێوڕەسمێن ئایینی یێن هەڤژینیا وان كری.

ل وی دەمی جهەكێ خۆش و باش بۆ ئاغایی و ئەندامێن خێزانا وی هاتبوو بەرهەڤكرن و ئاهەنگا وان دەستپێكر و هەتا نیڤا شەڤێ ڤەكێشا.

ل یەك ژ كوژیێن گوڕەپانێ، سوڕەیا دگەل هژمارەكا ژنێن گوندی یا ڕوونشتی بوو، یەك ژ وان ژنێن چالاك خالەتا وێ زەهرا بوو ئەوا سوڕەیا ب جوانترین شێوە خەملاندی و دڤیا ئاهەنگا وان ب ئاوایەكێ باش و نموونەیی بڕێڤە بچیت.

زەهرایێ بریێن بووكێ تەنك كرن و لێڤێن وێ سۆراڤ كرن و ڕەنگەكێ پیڤازی ژی ل سەر رویێن وێ دا و چاڤێن وی ژی ب ڕەنگێ ڕەش كل دان و پرچا وێ ژی شەڤا بەری هینگێ خەنا كربوو داكو ب جوانترین شێوە دیاربیت. ل دووڤ دا ڕستەكەكا زێڕی ژی ل دور گەردەنا وێ ئالاند و تبلێن وێ بۆیاغكرن داكو كچا خووشكا وێ ببیتە جوانترین بووك ل گوندی.

ل دووڤ تیتال و نەریتێن گوندی، وێ دواغەکا سپی ژی دانا سەر سەرێ بووکێ داکو ب درێژاهیا دەهواتێ چاڤێ کەسێ ڤێ نەکەڤیت هەتا رێورەسمێن پێکئینانا خێزانێ ب دوماهی دهێن.

پشتی ئاهەنگا وان شاریایی و گەرم بووی و هەموو کەیفخۆش بووین، سێ بەرخ هاتنە سەرژێکرن و لەشێ وان هاتە دوهنکرن داکو ل سەر ئاگری بهێنە قەلاندن یێ کو چریسکێن وێ د چوونە بەر ئەسمانان.

موزیکژەن بەردەوام بوون ل سەرژەنینا ئامیرێن خوە و گوتنا ستران، هێدی هێدی زەلام رابوونە دەهواتێ و دەستێ هەڤدوو گرتن و ئاوایەکێ بازنەیی ل دورماندوری ئاگری پێکئینا. د هەمان دەم دا ژن ژی ل لایەکێ گورەپانێ د راوەستیایی بوون و دەست دقوتان.

پشتی بەرهەڤبوونا خوارنێ، ل دەستپێکێ خوارن بۆ ئاغایێ گوندی د سێنیکان دا هاتە پێشکێش کرن، لی وی حەزدکر برنج و گوشتی ب دەستی بخۆت ژبەرکو ئەڤە یەك ژ تیتالێن گوندیان یێن کەڤن بوو.

ئاهەنگ و دەهوات هەتا درەنگی شەڤ بەردەوام بوون و پاشی هێدی هێدی هەر یەك چوو مالا خوە داکو بنڤیت، ل دووڤ دا بووك و زاڤا ژی چوونە مالا بابێ زاڤای. ل روژا پاشتر بووك و زاڤا و مەلایێ گوندی و ب بەرهەڤبوونا ئاغایێ گوندی رێورەسمێن مارکرنا وان ل بازێری ب ئاوایەکێ فەرمی و یاسایی برێڤەبرن.

مەلای سێ جاران گوتە زاڤای:

"تو یێ رازی سورەیا ببیتە هەڤژینا تە؟"

ل هەردوو جارێن یەکی وی چ بەرسف نەدان لێ ل جارا سییێ گوتی بەلێ ئەز پێ ڕازیمە. مەلای هەمان پرسیار ژ سوڕەیاییێ ژی کر، لێ وێ ژی ل جارا دوماهییێ ژ نوو ڕازیبوونا خوە دیارکر.

پشتی هینگێ بووك و زاڤا قورئانەك هەلگرت و ماچی کر و کاغەزێن مارکرنێ ئیمزاکرن و پاشی مەلای بەلگەنامەیا هەڤژینیا وان خواند. ل دووڤ دا ئاغاییێ گوندی بڕیاردا قوریکەکێ جوان و مەحفیر و فانوس و بڕەکا پارەی بدەتە خوداما خوە یا بەرێ وەك دیاری داکو ئەو ژی وەکی مەهر بدەتە هەڤژینێ خوە عەلی زێدەباری وێ مەهرا عەلی ژ مالا بابێ سوڕەیاییێ وەرگرتی.

عەلی ژبلی وێ ڕستکا دایکا وی کریە دیاری بۆ سوڕەیاییێ دگەل چاکیتەکی داکو خوە ژ سەرما زڤستانێ بپارێزیت و کەرەکێ مەحفیرێ پێ کەڤن، وی چ تشتێ دی پێشکێشی وێ نەکر ب تنێ ئەو نەبیت کو سوزداییێ کو ئەو ب هەموو هێز و شیانێن خوە ڤە کار بکەت داکو ژیانا خێزانا خوە بەختەوەر بکەت.

ل ئێڤاریا وێ ڕۆژێ، خالەتا وێ زەهرا دگەل هندەك ژنێن دی دووبارە سەروبەرێ وێ ڕێکئێخست و سەرێ وێ شووشت و گەلەك گولاڤ و بێهنێن خۆش لێ ڕەشاندن. پشتی هینگێ بووك و زاڤا مانە ب تنێ، سوڕەیاییێ شەرم دکر خوە پەیڤەکا ب تنێ ژی بێژیت لەوڕا هەر یەکسەر زاڤای ئاگرێ لەمپێ ڤەمراند و خوە د سوڕەیاییێ وەرکر.

پشتی بورینا دەهـ هەیڤان ل سەر ژیانا وان یا هەڤژینییێ، سوڕەیاییێ زارۆکەك بوو و ناڤێ وی کرە "حسێن"، پاشی زارۆکەکێ دی

ژبەر وێ چوو، پشتی دوو سالان زارۆکەکێ دی ژی ئینا سەر دنیایێ و ناڤێ وی کرە "حەسەن" و ل دووڤ دا دوو کچێن دی بوون ب ناڤێن "مریەم" و "لەیلا"، پشتی هینگێ وێ زارۆکەکێ دی بوو کو دەمێ هاتیە سەر دنیایێ یێ مری بوو، پاشی هندەك زارۆکێن دی ژی وێ ئینان هەتاکو سالا شۆڕەش پەیدابووی وێ دوماهیك زارۆکا خوە ئینا سەر دنیایێ و ناڤێ وێ کرە خوچستە". د ماوەیێ چواردە سالان دا، سوڕەیایێ نەهـ زارۆك بوون و دوو ژی ژبەر چووبوون.

عەلی ژی وەکی بابێ خوە کەسەکێ بێ خیرەت و بکێرنەهاتی بوو، لێ ئەو چەندە هندێ ناگەهینیت کو وی خوە ژ کارێن خڕاب ژی دابیتە پاش ب تایبەت وان کارێن نەباش یێن ب سانەهی دەسکەفتەکێ باش پێڤە دهێت. هەر کارەکێ قەدەغەکری و دژی یاسایێ بایە سەرنجا عەلی دڕاکێشا. هەر دەمێ دەلیڤەکا دزیێ بۆ وی هەلکەفتبایە وی ژ دەستێن خوە نەدکر.

هەرچەندە وی هندەك جاران کارێ نێچیرکرنا ماسیان ژی دکر لێ دەمێ هەڤالێن وی مژوول دبوون، دا ماسیێن وان ژێ دزیت. پشی پەیدابوونا شۆڕەشا ئیسلامی ل ئیرانێ و وان گوهۆڕینێن ل وەلاتی ب گشتی و ل گوندی ب تایبەتی پەیدابووین، بوونە ئەگەر ئەو ژ کەسەکێ چنە ببیتە کەسەکێ گرنگ.

ئەو هەر هەیڤێ جارەکێ دا ل پاسا گوندی سوار بیت و بەرەڤ بازێری چیت ژ بۆ ئەنجامدانا کارەکی، لێ کیژ کاری؟ د ڕاستی دا، سوڕەیایێ چ تشت ژێ نەدزانین و کا بۆچی ئەو دچیتە بازێری یان چ کار ل وێرێ دکەت، لێ دەمێ ئەو ژ بازێری دزڤڕی ب سەدان ڕیال د بەریکا وی دا بوون

کو تێرا پێدڤیێن زارۆك و خێزانا وی دکر، لێ وی ئەڤ پارە ژ کیڤە دئینان؟ ب تنێ خودایی دزانی.

هێدی هێدی عەلی ژ هەڤژینا خوە دوور دکەفت. ل ناڤ گوندی گوتگوتکەك بەلاڤبوو کو عەلی پەیوەندیەکا نەشەرعی دگەل ژنەکێ ل باژێری هەیە و برایێ وێ ژنێ ژی پەیوەندیەکا باش دگەل بازارێ ڕەش ل باژێرێ زاهیدان هەیە.

پاشی هندەك گوتگوتکێن دی بەلاڤبوون کو وی دەست دگەل دزینا هندەك چەك و زێڕێن گرانبها و جگارەیێن ئەمریکی و ڤەخوارنێن کحولی و مادەێن بێهۆشکەر دا هەنە، پشتی هینگێ هۆسا هاتە زانین کو عەلی ل وی جهی بوو یێ کەسەك لێ هاتیە کوشتن ژبەر هندێ هندەك پۆلیس ژ باژێرێ کرمان هاتنە گوندی داکو ئیفادەیێن موختارێ گوندی وەرگرن و پاشی فرێکەنە د دووڤ عەلی ڕا، لێ ئەو ب دەستێن ڤالاْ زڤرینەڤە باژێری و نەشیان چ بەلگەیان ب دەستخوە ڤە بینن لەوڕا وان گەف ل عەلی کرن کو ب چ ڕەنگان نابیت ئەو ئێدی خوە نێزیکی باژێری بکەت.

پشتی ڤێ سزادانێ، ئێدی عەلی بوو کەسەکێ زێدە خڕاب و توندوتیژ دگەل خێزانا خوە و بەردەوام هەڤژین و زارۆکێن خوە دقوتان هەتا کار گەهشتیە هندێ ڕۆژەکێ سوڕەیایێ زارۆکێ خوە یێ ژ هەموویان بچووکتر دگەل خوە بر و ب چاڤێن گریڤە چوو مالا بابێ خوە و بڕیاردا بۆ ماوەیێ حەفتیەکێ نەزڤریتە مالا خوە.

ل ڤی دەمی، خالەتا وێ زەهرا دچوو مالا وێ و خوارن بۆ زارۆکێن وێ چێدکر و مالا وێ ب سەروبەر دکر، پشتی هینگێ عەلی هەست ب

پەشیمانیێ کر ل سەر وی کارێ وی دگەل سوڕەیایێ کری لەوڕا چوو مالا بابێ وێ و داخوازا لێبورینێ ژێ کر و هەڤژینا خوە زڤڕاندە مال.

پشتی بورینا دەمەکی، هێلێن قورمچین و پیراتیێ ل سەر دێمێ سوڕەیایێ دیار بوون و جوانیا وێ بەرزەکر هەتا وی ڕادەی ئەو ژنا ب تنێ ژیێ وێ بیست و هەشت سال دا بێژی ژیێ وێ ژ پێنجی سالان یێ بوری، د ڤی دەمی دا سیستەمێ حوکمڕانیێ ل ئیرانێ هاتە گوهۆڕین و ل شوونا وێ کۆمارا ئیرانێ هاتە ڕاگەهاندن و هەموو وێنەیێن شاهی و هەڤژینا وی یا شاهژن هاتنە لادان و ل شوونا وان وێنەیێن هندەك کەسێن خۆدان دەرسوك و ڕیهـ درێژ هاتنە هلاویستن.

ل گوندێ کوبایێ هەموو تشت وەکی خوە مابوون ب تنێ ئەو دەنگوباسە یێ نوو بوو یێ دگوتی سیستەمێ دەستهەلاتێ یێ نوو ل ئیرانێ ئێدی دووبارە ڕێکێ ددەتە زەلامان پتر ژ هەڤژینەکێ بۆ خوە بینن. ئەڤ دەنگوباسێ نوو گەلەك یێ ب دلێ عەلی و زەلامێن دی یێن وەکی وی بوو لەوڕا وی ب یەکجاری خوە ژ سوڕەیایێ دوور کر.

سوڕەیایێ قەت گازندە ژ ڤێ ڕەفتارا نوو یا هەڤژینێ خوە نەدکرن چونکی ئەو ئێدی وەکی بەرێ نەدهاتە مال ب تنێ کێم جاران نەبیت، هندەك جاران بۆ ماوەیێ سێ چوار ڕۆژێن ل سەر یەك دا مینتە ل ناڤ دارستانێ یان دا دناڤ گەلی و نهالان دا نڤیت. ژبەرکو سوڕەیا کەسەکا ژ خوە شەرم بوو، نەدڤیا کەس هەست ب ڤێ چەندێ بکەت و وێ بەحسێ هەڤژینێ خوە بۆ کەسێ نەدکر و گازندەیێن خوە د دلێ خوە دا د هەلگرتن.

ڕۆژەکێ سوڕەیایێ گوتە دایکا خوە:

"دادێ من دڤێت بمرم، ئەز ئێدی نەشێم خوە ل بەر نەخۆشیێن عەلی بگرم چونکی ئەو هەموو گاڤان من و زارۆکان دقوتیت و گەلەك بێ ڕێزی و سڤکاتیێ ب مە دکەت."

خانما شەوکەت نەدشیا چ بکەت ژبلی کو ئەو بێدەنگیا خوە بپارێزیت، ئەو نەدشیا هاریکارییا سوڕەیایێ ژی بکەت چونکی تیتالێن گوندێ وان د هۆسا بوون ڕێك نەددا دایك و بابێن هەڤژینان مایێ خوە د ئاریشەیێن وان دا بکەن لەوڕا ئەڤ چەندە ژی یەك ژ وان ئەگەران بوو زەلام یێ زالێ بیت ل سەر هەڤژینا خوە، تشتەکێ سەیر نینە دناڤ جڤاکەکێ هۆسا دا زەلام ب تنێ بڕیاران بدەن و چ هزرێ بۆ ژنان نەکەن یان بۆچوونێن وان ل بەرچاڤ وەرنەگرن.

ئێدی خەلکێ گوندی دەست ب وێ گوتگوتکێ کر

(مادەم عەلی دچیتە باژێری و هند ل مالا خوە نینە، ڕامانا وێ ئەوە سوڕەیا ژنەکا باش نینە و کارێن خڕاب ل پشت هەڤژینێ خوە ڕا دکەت.)

ئەڤێ چەندێ گەلەك نەخۆشی دگەهاندە سوڕەیایێ و وێ هەست ب شەرمەکا مەزن دکر دەمێ دناڤ گوندی ڕا چووبایە، ئێدی خەلکێ گوندی هێدی هێدی خوە ژ وێ دوور دکر و کەسێ دگەل نەدئاخفت ب تنێ هندەك کەسێن کێم نەبن ئەو ژی ب ئاوایەکێ نهێنی و ب تنێ.

دەمێ ئەو  د بەر خەلکی ڕا چووبایە، خەلکی ئاخفتن و گوتنێن نە جوان دگوتنێ. ژبەر هندێ ئەو یا نەچار بوو سەرێ خوە ژبەر وان بچەمینیت و پووتە ب ئاخفتنێن وان نەکەت.

هندەکان دگوتنێ:

"تو ژنەکا نە باشی هەکە بۆچی تو ژی وەکی ژنێن دی یێن گوندی نەشیایی دگەل هەڤژینێ خوە ب بەختەوەری بژی."

هندەکێن دی دگوتێ:

"ئەو ژنا نەشێت ئاریشەیێن خوە دگەل زەلامێ خوە چارەسەر

بکەت و پەنایێ بەتە بەر مالا بابێ ئەو ژنەکا بکێرنەهاتیە."

گوتنا ژ هەموویان نەخۆشتر ژی ئەو بوو دەمێ دگوتینێ:

"کوڕێ وێ یێ بوویە درەوین و دزیکەرێ گوندی و چ شوولێ خراپە ئەو دکەت، هەکە ئەو دایکەکا باش بایە دا شێت زارۆکێن خوە ب جوانی پەروەردە کەت."

ژ لایەکێ دی ڤە کەسێ سەرەدانا وێ نەدکر ب تنێ هندەك هەڤالێن وێ یێن نێزیك نەبن، لێ وان ژی ب چ ڕەنگان نەدوێریا سوڕەیایێ مێهان بکەنە مالا خوە بەلکو هندەك جاران ب دزیکی ڤە دگەل وێ دئاخفتن و دلەك ل بەر دلێ وێ ددا.

سەرەڕای ڤان نەخۆشیان، سوڕەیایێ خوە ل بن کڕاسێ بێدەنگیێ دڤەشارت و گازندە بۆ کەسێ نەدکرن ب تنێ خالەتا خوە زەهرایێ نەبیت.

دەمێ ئەو دمایە ب تنێ وێ گەلەك بۆ ڕەوشا خوە دکرە گری لێ کەسەك نەبوو رۆندکێن وێ پاقژ بکەت یان گوهداریا خەمێن وێ بکەت.

دەمەکێ درێژ نەبوری دەمێ کارەساتەکا دی یا مەزن ڕوودای ئەو ژی مرنا دایکا وێ بوو، پشتی ڤێ چەندێ ئێدی سوڕەیا ب یەکجاری نەدشیا ژ مال بدەرکەڤیت و بۆ ماوەیێ حەفتیەکێ وێ خوارن نەخوار، لێ ل ڕۆژا حەفتێ جارەکا دی هێزا خوە زڤڕاندەڤە ئەو ژی پشتی بابێ وێ سەرەدانا وێ کری و ئەو ڕستك کرە ستۆیێ وێ یا دایکا وێ بۆ وێ هێلای.

کەیفا سوڕەیایێ ب ڤێ ڕستکێ هات و پاشی دەستێ بابێ خوە ماچیکر، دەمێ بابێ وێ خاترا خوە ژێ خواستێ ئەو هەتا بەر دەرگەهی دگەل چوو و پاشی چوو بن گوهێ وی و گوتێ:

"ژبیر نەکە باب ئەز گەلەك حەز ژ تە دکەم."

پاشی وێ دەرگەهـ گرت و چوو د ژوور ڤە.

ڕۆژەکێ دەمێ خەلکێ باژێری هەموو ژ گوندی دەرکەفتین داکو بیرەوەریا ڕۆژا "سێزدەی بەدرێ" نوو بکەن کو ڕۆژا سێزدێ یە ژ سالا نوو یا ئیرانی و خەلك تێدا دەردکەڤنە ناڤ سروشتی و بۆ ماوەیەکی ژ مالێن خوە دوور دکەڤن کو ئەڤەژی یەکە ژ دابونەریتێن وان و ب بۆچوونا وان ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەر مالێن وان ژ گیانێن خراب یێن سالا بوری پاقژ ببن، سوڕەیا ژ مال نەدەرکەفتبوو، لێ وێ هند دیت ترۆمبێلەکا ئەمریکی ل بەر دەرگەهێ وێ ڕاوەستیا، ئەو چوو د پەنجەرێ دا سەحکرێ دیت عەلی و ژنەکا دی ژ ترۆمبێلێ هاتنە خوارێ و بەرەڤ ژور ڤە هاتن.

سوڕەیایێ خوە د کوژیەکێ خانی ڤە ڤەشارت، وی دیت عەلی هێدی دەرگەهـ ڤەکر و هاتە د ژوور ڤە و پاشی دەرگەهـ ل خوە گرت، عەلی و وێ ژنێ دەست ب سحبەتان و کەنیێ کرن. سوڕەیایێ ژ ئاخفتنێن وان زانی کو هەڤژینێ وێ ئەڤ ژنە یا ئینایە د مال ڤە داکو ببەتە د ژوورا وێ یا نڤستنێ ڤە و وەختەکێ خۆش دگەل ببورینیت، ژبەرکو ئەڤە یەك ژ وان ژنێن لەشفرۆش بوو یێن لەشێ خوە بەرامبەر چەند سەد ڕیالەکان دفرۆشنە زەلامان، لێ ل ڤێرێ تشتێ سەیر ئەو بوو عەلی نەشێت ڕیالەکی بۆ زارۆکێن خوە پەیدابکەت، ئەرێ پا وی ئەڤ ترۆمبێلە و پارەیێ ڤێ لەشفرۆشێ ژ کیڤە ئینایە.

پشتی بورینا نیڤ دەمژمێرێ، عەلی و ئەو ژنا لەشفرۆش سواری ترۆمبێلێ بوون و ژ گوندی دەرکەفتن، سوڕەیا ژ جهێ خوە هاتە دەرێ و چوو ژوورا خوە یا نڤستنێ پاقژکر کو هێشتا شوونوارێن بێهنا گولاڤێ و کەرەستەیێن جوانکاریێ یێن وێ ژنێ لێ مابوون، ل وی دەمی یەکسەر خالەتا وێ زەهرا هاتە د ژوور ڤە و چاڤێن وێ ب چاڤێن سوڕەیایێ کەفتن.

بەری کو سوڕەیا یەك پەیڤ ژی بێژیت، خالەتا وێ گوتێ:

"پێدڤی ناکەت تو چ تشتان بێژی چونکی من هەموو تشت ب چاڤێن خوە دیتن، ئەز ژی وەکی تە ژ مال نەدەرکەفتیمە، ئەز یا هاتیمە ڤێرێ دا هاریکارییا تە بکەم."

پشتی هینگێ هەر یەکسەر زەهرایێ ئەو جهـ هێلا و چوو مالا خوە.

ئێدی بۆ سوڕەیایێ باش دیار بوو کو هەڤژینێ وێ بەردەوام دچیتە مالا ژنێن لەشفرۆش ل باژێرێ کرمان، چونکی هەموو گاڤان دەمێ ئەو دهێتە مال هێشتا بێهنا گولاڤێن ژنێن لەشفرۆش ژ جلێن وی دهێت، لێ ئەڤە یەکەم جار بوو ئەو ژنەکا هۆسا بینتە د مالا خوە ڤە و ل سەر جهێن نڤستنێ یێن هەڤژینا خوە کارەکێ خراب دگەل بکەت.

سوڕەیایێ دزانی کو هەڤژینێ وێ هندەك کارێن نەباش و جهێ گۆمانێ دکەت ژبەرکو هندەك جاران نیشانێن زەنگینی و خۆشیێ ل سەر وی دیار دبن، هەروەسا وێ دزانی کو "ئەرباب"، ئەو زەلامێ زەنگین یێ سوڕەیایێ د زارۆکینیا خوە دا ل دەڤ کاردکری و د هەمان دەم دا ئاغایێ گوندی بوو، یێ هاتیە زیندانکرن، لێ بۆچی عەلی ترۆمبێلا وی دهاژووت؟ کەنگی ئەو فێری هاژووتنا ترۆمبێلێ بوویە و کێ ئەو فێرکریە؟

سوڕەیایێ گەلەك جاران هزرا خوە دبەرسڤا ڤان پرسیاران دا دکر لێ ئەو نەشیا بگەهیتە چ ڕاستیان چونکی وێ هەموو پەیوەندیێن خوە دگەل خەلکێ گوندێ بڕیبوون، وێ ب تنێ پێشوازییا بابێ خوە یێ پیر ل مال دکر، خالەتا وێ ئەوا بوویە بێدەنگکەرا نەپەنیێن وێ، زێدەباری موختارێ گوندی.

هەردەمێ عەلی هاتبایە مالا خوە، یەکسەر دا بیتە کەسەکێ تۆڕە و هار و جهێ ترسێ، هەر کەسەکێ ژ مالا وی کەفتبایە بەر سینگێ وی دا لێ کەتە هەوار و قوتیت خوە هەکە چ نەکربایە ژی. دگەل ڤێ چەندێ سوڕەیایێ چ گازندە نەدکرن و نەدکرە گری ژی، وێ ب بێهنفرەهی و بێدەنگی خوە ل بەر ڤێ سەرەدەریا وی یا نەخۆش دگرت.

ئەگەر وێ ڤیابایە بکەتە گری ژی دا خوە گریت هەتا ئەو مابایە ب تنێ داکو زارۆکێن وێ رۆندکێن وێ نەبینن. لێ زارۆکێن وێ چ ژ ڤێ چەندێ نەدزانی و هەر گاڤا بابێ وان زارۆکێن خوە قوتابان، دا ئەو تێر کەنە گری.

سورەیایێ تێبینییا هندێ دکر کو ئێدی زەلامێ وێ و مەلایێ گوندی گەلەك دگەهنە یەك و دبن لێڤکان ڤە د ئاخڤن، وێ دزانی کو پەیوەندیەکا سەیر یان بابەتەکێ هەڤپشك یێ وان دگەهینتە یەك.

هێدی هێدی بۆ سورەیایێ دیار بوو کو عەلی چاڤێ خوە یێ بریە مال و ملکێ مەلا حەسەنی کو مەلایێ گوندی یە، حەزدکەت ئەو ژی وەکی مەلای لێ بهێت، لەورا وی حەسیدی ب مەلای دبر و هزرا خوە تێدا دکر کا چەوا ئەو هۆسا ب سانەهی شیایە زەنگین ببیت و خەلکێ گوندی هەموویێ ب خوە داخبار بکەت و گوهداریا ئاخفتن و شیرەتێن وی بکەن ژبەر هندێ وی هزر د هندێ دا کر کا چەوا ئەو ژی دێ وەکی مەلای لێ هێت.

بزاڤێن عەلی ب ڕاستی جهێ پێکەنینێ بوون، ژبەرکو هێشتا ئەو یێ وەکی کەسەکێ پاشکەفتی و خشیم دئاخڤیت و جلێن وی هەموو گاڤان د پیس و دڕیاینە و ڕهـ و سمبێلێن وی ژی د درێژ و بێ سەروبەرن، هەروەسا ئەو زوو ب زوو سەرێ خوە ناشووت و بەردەوام بێهنێن پیس ژێ دهێن، ئەو گولاڤا ئەرزان یا ئەو ل خوە دکەت ژی بێهنا وی یا پیس بەرزە ناکەت.

لێ مەلا حەسەنی ئەو چەندە تێ دئینا دەر کو ئەو ب گەلەك ڕەنگان دشێت مفای ژ عەلی وەربگریت، ژبەر هندێ وی هندەك جاران خوە دگەهاندە عەلی و ب هندەك پەیڤێن سادە دگەل وی د ئاخفت داکو تێ بگەهیت، سوڕەیایێ گەلەك جاران ئەو پێکڤە ددیتن و دەستێن وان ل سەر ملێن یەك بوون و دکرنە کەنی و هندەك زەرف یان کاغەز لێك دگوهاڕتن.

مەلا حەسەنی گەلەك سەحدکرە سوڕەیایێ و دڤیا خوە نێزیکی وێ بکەت لێ کەربێن سوڕەیایێ گەلەك ژ وی ڤەدبوون و قەت دەلیڤە نەدایێ دگەل وێ باخڤیت دەمێ دهاتیە دەڤ و خوە نێزیکی وێ بکەت.

ڕۆژەکێ بێ دەستیری خوە هاڤێتە د ژوور ڤە و پاشی دەست ب ئاخفتنێ کر و گوتێ:

"خانم سوڕەیا ئەز ل دووڤ داخوازا عەلی یێ هاتیمە ڤێرێ ......."

ئەڤ هاتنا وی نە یا سەیر بوو بۆ سوڕەیایێ چونکی ژ مێژە وێ پێشبینیا هندێ کربوو کو مەلای دڤێت دگەل وێ باخڤیت ل دور بابەتەکێ تایبەت و ئاها نوکە ئەو دەم هات.

پاشی مەلا حەسەنی قورئانەك ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و دانا سەر مێزێ و گوت:

"هەڤژینێ تە یێ هاتیە دەڤ من و گازندان ژ تە دکەت کو تو ئێدی دگەل وی نائاخڤی و تە ئەو بۆ هەموو تشتان یێ پشتگوهـ هاڤێتی و ناهێلی ب شەڤێ بهێتە سەر جهێن تە."

سوڕەیایێ ب ناڤ چاڤ گرێ ڤە سەحکرێ بێی کو یەك پەیڤ ژی باخڤیت.

پاشی مەلای بەردەوامی دا ئاخفتنا خو و گوت:

"ئەو هەڤژینێ تەیە و وی هەمووو مافێن هەڤژینیێ ل سەر تە هەنە، تو ڤان تشان باش دزانی کو وی هندەك ماف یێن ل سەر تە هەین کو نابیت تو وی ژێ بێ بەهر بکەی. ئەو هەڤژینەکێ باشە و پارەیان بۆ خێزانا خوە دابین دکەت و حەز ژ زارۆکێن خوە دکەت."

ل وی دەمی ڤێ خانمێ دڤیا ب ڤان ئاخفتنێن مەلای بکەتە کەنی لێ ئەو شیا ل سەر خوە زالێ بیت، دگەل هندێ ژی ئەو زێدەتر نەشیا گرێنژینا خوە ئەوا ل سەر لێڤێن وێ وێنە بووی بڕاوەستینیت لەوڕا وێ پرتەکا دەرسوکا خوە دا بەر دەڤێ.

مەلای گوت:

"عەلی دڤێت دگەل تە بگەهیتە چارەسەریەکێ، وی ب درێژاهی ئەڤ بابەتە دگەل من گەنگەشە کریە و ل دوماهیێ ئەو یێ گەهشتیە رێکەفتنەکا باش و دادپەروەر، ئەڤە من بۆ تە دیارکر کا وی چ دڤێت."

پاشی وی دەستێ خوە ب ڕهێن خوە دا ئینا خوار و بەرچاڤکا خوە زڤڕاند و گوت:

"وی دڤێت تە بەردەت چونکی وی بۆ خوە هەڤژینەکا دی ل بازێری دیتییە، وی هند پارە نینن ئەو دوو هەڤژینان ب خۆدان بکەت لێ ئەو یێ ئامادەیە ئەو ڤی خانی و زارۆکان و ناڤمالیێ هەموویێ بۆ تە

بهێليت، هەروەسا ئەو زەڤيا بچووك يا ل بنێ گوندى ژى دێ بۆ تە بيت داكو بۆ خوە تشتان دناڤ دا بچينى، لێ بەرامبەر ڤێ بەردانێ ئەو خوە ڕيالەكى ژى نادەتە تە."

مەلاى چاڤێن خوە بلندكرن و سەحكرە سوڕەيايێ كا دێ بەرسڤا وێ چ بيت، لێ وێ چ بەرسڤ نەبوون، لەوڕا مەلا ل سەر ئاخفتنا خوە بەردەوام بوو:

"ئەز دبينم ئەڤ چەندە باشترين چارەسەريە بۆ هەوە و هوون هەردوو ژێكڤەبن و ئەز دێ هاريكارييا هەوە كەم ل سەر بەلگەناميا بەردانێ و پشتێ هينگێ كەسێ ژ چ هەوە ماف ل سەر يێ دى نامينيت، عەلى دێ هەموو تشان بۆ تە هێليت و ئەڤ چەندە ژى كارەكێ پڕى دلۆڤانيە، ما تو نابينى ئەڤ چەندە بۆتە ژى گەلەك باشە؟"

لێ سوڕەيايێ ديسان چ بەرسڤ نەدانێ.

وى گوت:

"سوڕەيا خان ئەز و تو ب تنێ يێ ل ڤێرێ و ئەز زەلامێ ئۆلى مە، تو دشێى باوەريا خوە ب من بينى، ها تە چ گوت؟"

مەلا حەسەن ژ ڤێ گەنگەشەيێ پەريشان بوو و هۆسا ديارە ئەوى پيچەك هەست ب شەرمێ كر و پاشى گوت:

"من دڤێت تشتەكێ دى ژى بێژمە تە، ئەز دێ ڕێكەفتنەكا دى دگەل تە گرێدەم كو ئەڤ چەندە يا ب من ڤە ب تنێ گرێدايە و عەلى چ

پەیوەندی پێ ڤە نینە، ڕێکەفتنا من ژی ئەوە .... ئەز نزانم دێ چەوا بۆ تە بێژم."

ل وی دەمی مەلای زێدە هەست ب شەرمێ کر، دێمێ وی تژی خوهـ بوو و تبلێن وی ڕەق بوون و پاشی وی دەستێ خوە هاڤێتە قورئانا خوە و گوت:

"ئەز یێ ئامادەمە چاڤێ خوە بدەمە تە و زارۆکێن تە ژی ب خۆدان بکەم ژبەرکو تو ژ هەژی ڤێ چەندێ، ئەز دێ جار جارا هێم سەرا تە دەم داکو پتر دگەل یەك باخڤین و پتر هەڤنیاسیێ دگەل یەك بکەین."

مەلا ئێدی نەشیا بەردەوامیێ بدەتە ئاخفتنێن خوە و پاشی ڕابووڤە و بەرامبەر سورەیایێ ڕاوەستیا کو هێشتا ئەو ل جهێ خوە یا ڕوونشتی بوو.

ل وی دەمی خالەتا وێ زەهرا هاتە د ژوور ڤە کو چاڤێ مەلای لێ نەبوو، زەهرا بەرەڤ مەلای ڤە هات و ئەو ب دیتنا وێ مەندەهۆش بوو و ڕەق د جهێ خوە دا ڕاوەستیا.

خالەتا وێ گوت:

"هێژایێ حەسەن لاجیفاردی خوە تو کی بی، ئەگەر نوکە تو ژ ڤێ مالێ نەدەرکەڤی دێ ڤی گوندی هەموویێ ب سەرێ تە دا ئینم، دڤێت تو شەرم ژ خوە بکەی هەی نەفرەتێن خودایی ل تەبن، هەی خودایی تو کوشتی و د هیلاك بری، هەی دڕندەیێ پیس، زوو دەرکەڤە."

مەلای خوە ڕاگرت و گوت:

"خانم زەهرا تو شاش یا د بابەتی گەهشتی، تو نزانی کا مەرەما من بۆ هاتنا ڤێرێ چ بوو، ئەز گەلەك رێزێ ل خانم سورەیایێ دگرم لێ ئەز نزانم تە چ هزر ژ من کریە هەتا هۆسا تۆرە ببی و ئاخفتنێن نەجوان بێژیە من."

زەهرایێ بەرسڤا وی دا و گوت:

"تشتێ هاتیە سەر هزرا من ئەوە کو تو کەسەکێ بێ قیمەتی و پیساتیا تە ب چ رەنگان ناهێتە دیارکرن لێ سەروبەرێ تە و وێ شاشکا ل سەرێ تە تو یێ کریە زەلامەکێ رێزدار، تو جهێ شەرمزارییێ بۆ قورئانا پیرۆز ئەوا د دەستێ تە دا، زوو ژ ڤی خانی دەرکەڤە و ب چ رەنگان پێ خوە نێزیکی ڤێرێ نەکەیەڤە."

پشتی وێ رۆژێ مەلا حەسەنی بریار دا تۆلا خوە ژ کچا مورتەزایێ رەمەزانی ڤەکەت لێ ئەو نەدشیا چ پێنگاڤان بهاڤێژیت هندی خالەتا وێ زەهرا پشتەڤانا وێ بیت و وێ بپارێزیت.

# بەشێ دووێ

پشتی سەرکەفتنا شۆڕەشا ئیسلامی ل ئیرانێ و پەیدابوونا چەندین گوهۆڕینان ل گوندێ کوپایێ، ئێدی عەلی پتر ژ بەرێ هەڤژین و زارۆك و مالا خوە بجه دهێلا ب تایبەت پشتی کو هەڤنیاس و هەڤالینی دگەل شۆفێرێ وێ پاسێ چێکری یێ هەموو حەفتیان دهاتە گوندی کو ناڤێ وی نەسڕوللاھ بوو.

ڤی شۆفێری بەحسێ باژێرێ کرمان و وان تشتان بۆ دکر یێن ل گوندی نەیی وەك گازینو و کافێ و بازاڕێن مەزن یێن باژێری، هەروەسا وان کارێن ب سانەهی یێن داهاتەکێ باش بۆ مرۆڤی پێڤە دهێت.

هەلبەت ئەڤ چەندا عەلی گوهلێبووی گەلەك یا ب دلێ وی بوو، ڕۆژەکی وی بڕیاردا ئەو دگەل نەسڕوللاهی بچیتە باژێری و وان تشتان ب چاڤێن خوە بینیت یێن وی بەری نوکە ل سەر باژێری گوهلێبووین، پشتی هینگێ وی بڕیاردا هەر هەیڤ جارەکێ بچیتە باژێرێ و حەفتیەکێ ب مینتە ل وێرێ و پاشی بزڤڕیتەڤە گوندی، ڕۆژ بورین و ئێدی وی سەرەدانێن خوە بۆ باژێرێ کرمان پتر لێکرن تا وی ڕادەی ئەڤ سەرەدانە ژ هەیڤەکێ کرنە هەر پازدە ڕۆژان جارەکێ.

ل باژێری، عەلی هندەك جاران ل مالا نەسڕوللاهی دنڤست و هندەك جاران ژی ل گۆڕەپانا پشتێ یا بنگەهێ ڕاوەستیانا ترۆمبێلان و

هندەك جاران ژی ل وان چایخانەیان دنڤست ییّن وی بۆ خوە وەك كرێكار لێ كاردكر و چا و شەربەت ددانانە بەر خەلكی.

جادە و چایخانە و ئاڤاهییّن بلند ییّن باژێرێ بوونە ئەگەر عەلی ئاشنای جیهانەكا نوو و دلخۆشكەر ببیت، هەر كارەكێ هەبا وی دكر وەك گەهاندنا نامەییّن وی و كرێكاری و گەلەك كارێن دی، هەروەسا وی دڤیا پتر تێكەلیا خەلكی بكەت و خوە نێزیكی وان بكەت، لێ سەروبەرێ وی یێ پاشڤەمایی و ئاخفتنا وی یا سادە ڕێگر بوون ل هەمبەر ڤێ چەندێ.

لێ دگەل ڤێ چەندێ ژی، گوهداری و زیرەكیا وی د كاری دا بوونە ئەگەر خەلك هێدی هێدی ب شیانێن وی داخبار ببن و كەسایەتیا وی ژی بەرەڤ گوهۆڕینێ بچیت، ئێدی وی ب شێوازەكی دئاخفت كو وەكی یێ خەلكێ گوندی نەبوو ژبەركو ب تنێ خەلكێ باژێری ب ڤی شێوازێ ئاخفتنێ دگەل هەڤدوو دئاخفتن.

هەروەسا ئێدی ئەو هند پێشكەفت بەحسێ چەكێن بەنكێ و پارە و كارێن وەبەرهێنانێ دكر، ئانكو هەر كەسێ ئەو دیتبا یان گوهـ ل سحبەتێن وی بایە دا هزر كەت ئەو بازرگانەكێ مەزن و دەولەمەندە، لێ ئاریشە ل ڤێرێ ئەو بوو كەسێ نەدزانی ئەو كیژ جۆرێ بازرگانییێ یە ئەو دكەت.

سوڕەیایێ ژی قەت مایێ خوە د كارێ وی نەدكر، هەروەسا پۆلیسێن باژێری ژی هند مایێ خوە د كارێ وی نەدكر، لێ وان قەت نەدزانی كو ئەو زەرفێن عەلی د هەلگریت هندەك كەلوپەلێن قەدەغەكری ییّن دناڤ دا هەین.

هەر زوو خەلكێ گوندی زانی كو عەلی هندەك كارێن نەباش و خراب دكەت وەك وەرگرتن و ڤەشارتنا كەلوپەلێن قەدەغەكری یان یێن دزیێ و بازرگانیكرن ب كەلوپەلێن ژ لایێ حكومەتێ ڤە هاتینە قەدەغەكرن و بازرگانیا كەلوپەلێن قەچاخ.

هەر چەندە سورەیایێ قەت خوە ب سەر ڤی چەندێ ڤە نەدبر و پرسیارا كارێ وی ژی ژێ نەدكر ژبەركو ئەو یا پشتڕاستبوو عەلی ب چ رەنگان نهێنیا كارێ خوە بۆ وێ نابێژیت.

رۆژەكێ ترۆمبێلەكا ژ جۆرێ جێب هاتە گوندی و رەقیبەك و دوو مولازم ژێ هاتنە خوارێ و بۆ ماوەیەكێ درێژ دگەل موختارێ گوندی ئاخفتن و پاشی فرێكرە د دووڤ عەلی و بابێ وی را و بۆ ماوەیەكی دگەل وان ژی ئاخفتن و هندەك پرسیار ژێ كرن و پاشی گوند بجه هێلا، خوە یەكی ژ خەلكێ گوندی نەزانی كا ئەگەرێ هاتنا وان بۆ گوندی چ بوو.

پشتی ڤێ پێرابوونا نەخۆش، ئێدی شێوازێ سەرەدەریكرنا عەلی دگەل خێزانا وی گەلەك دژوارتر و رەقتر لێ هات تا وی رادەی هندەك جاران بێی ئەگەر وی هەڤژین و زارۆكێن خوە دقوتان ب تایبەت پشتی پۆلیسان هۆشداریەكا فەرمی دایە وی كو ب چ رەنگان نابیت ژ گوندی دەركەڤیت و نامەیەك دابوو ڤێ و ل سەر نڤیسا بوو (ئەگەر مە تو ل باژێری دیتی بێی پرسیاركرن یەكسەر دێ تە كەینە د زیندانێ ڤە.)

جارەكا دی عەلی نەچار بوو رۆژانێن خوە یێن پەریشان و نەخۆش ل ناڤ كولانێن گوندی ببورینیت، د ڤی ماوەی دا وی گەلەك كارێن سەیر و ئنتیكە ئەنجامددان. وی هندەك كار بۆ هندەك كەسان دكرن بەری

هینگێ ئەڤ کارە نەکربوون یان دا ب ئاوایەکێ هێدی بۆ ماوەیەکێ درێژ دگەل هەڤالێن خوە یێن گوندی برێڤە چیت.

عەلی ئێدی فێری ژیانا باژێری ببوو و خۆشیێن وێ ل سەر هزرێن وی نەدچوون، وی هزردکر ئێدی ئەو کەسەکێ باژێری یە، لێ ئەڤ گوندێ بچووکێ ئەو تێدا بۆ وی وەکی زیندانەکێ یە و ها دێ بێهنا وی تێدا تەنگ بیت.

ل وی دەمێ کورت یێ ئەو مایە ل باژێرێ کرمان، ئەو فێری گەلەك تشتێن نوو ببوو، وی هەموو گاڤان حەزدکر بچیتە چایخانێن نوو یان ژی هەما چ نەبیت دبەر ڕا ببوریت. گەلەك جاران دەمێ ئەو ل باژێری، ب سەدان یان ب هزاران خەلك دا دبەر وی ڕا بورن و کەسێ ئاگەهـ ژ وی نەبوو، لێ بەروڤاژی چاڤێ وی ل هەموو خەلکی بوو بەلکو یەك کارەکی پێ بدەتە کرن.

حەزا وی بۆ زڤڕینا باژێری ڕۆژ بۆ ڕۆژێ پتر لێ دهات ب تایبەت دەمێ وی بەحسێ بیرهاتنێن خوە یێن باژێری بۆ خەلکێ گوندی دکرن.

هەتا ڕۆژەکێ وی بەحسێ سەرهاتیەکا خوە دکر دەمێ یەك ژ سەرۆکێن ژنێن لەشفرۆش ئەو خەلات کری بەرامبەر وی کارێ وی بۆ کری، ئەو دگەل وێ ژنێ چوو مالا ژنێن لەشفرۆش و ل وێرێ گەلەك کچ و ژنێن دی یێن جوان دیتن، وی ب نیڤا دلێ خوە یەکا ژ هەموویان جوانتر بۆ خوە ژێ گرت و وەکی گیانەوەرەکێ برسی و دڕندە ئەو کێشا د ژوورەکێ ڤە. ژبەر ڤان کارێن وی ل باژێری کرین، وی سووند خوار هندی د شیانێن وی دا بیت ئەو ب زووترین دەم بڤەگەڕیتە باژێری.

پشتی شۆڕەشێ، گەلەك مرۆڤ ل ناڤ باژێرێ کرمان و دەوروبەری وێ هاتنە کوشتن. خویندارییێن کەڤن نوو بوونەڤە و هەڤرکییێن ناڤخۆیی پەیدابوون. گەلەك کەس هاتنە سێدارەدان و گەلەکێن دی ب تومەتا خیانەتێ هاتنە گونەهبارکرن، لەوڕا هەر کەسێ دەلیڤە بۆ هەلکەفتی وەلاَت بجە هێلا و یێن دیژی کەفتنە بەر پێلا پاقژکرن و کوشتنێ.

ژبەر ڤان ڕوودانان عەلی زانی باژێرێ کرمان وەکی بەرێ یێ ئارام نینە داکو ئەو بزڤڕیتێ ب تنێ ل وەرزێ پاییزێ نەبیت.

پشتی بورینا هەشت هەیڤان ل سەر گەهشتنا ئیمام ئایەتوللاهـ خومەینی بۆ سەر کورسیکا دەستهەلاَتێ ل ئیرانێ، عەلی سواری وێ پاسێ بوو یا ژ گوندی بەرەڤ باژێری دچووی، لێ ئەڤ جارە ئەو ل بنگەهێ دوماهیێ هاتە خوارێ نەك ل وێ گۆڕەپانا مەزن و بەرفرەهـ ئەوا مزگەفتەك ل نیڤا وێ کو بەری هینگێ وی لێ کاردکر.

پشتی ئەو هاتیە خوارێ و پیچەکێ برێڤە چووی. دەنگەك هاتە گوهێن وی

"عەلی، عەلی."

یەکسەر ترسێ دلێ وی گرت، وی بەرێ خوە دا ڕەخێ دی یێ جادەیێ ئەو جهێ کو دەنگ ژێ دهاتی دناڤ چایخانەکێ دا، لێ وی ئەو کەس نەنیاسی یێ گازی دکریە وی.

وی زەلامی گوتێ: "عەلی وەرە ڤێرێ، ئەز یێ ژ تە خەریب بوویم."

عەلی لێ زڤڕی، پاشی ل جادەیێ بوری و چوو دەستێ وی و هەردووکان پەیڤێن بخێرهاتن و سلاڤێ پێشکێشی هەڤدوو کرن. پاشی وی زەلامی گوت:

"تەماشە بکە، ئەڤە دوکانا منە و هەمو تشتێن تێڤە یێن منن. بەری نوکە من ل بەر دەستێ کەسەکی کاردکر کو یەك ژ دووکەفتیێن شاهی بوو و گەلەك دوکان ل بازێری هەبوون، لێ من ژی پشکداری د شۆڕەشێ دا کربوو لەوڕا ئیمام خومەینی ئەز خەلاتکرم و ئەڤ دوکانا وی بۆ من ما و نوکە ئەز فێقی و کەسکاتی و شریناهی و ڤەخوارنان تێڤە دفرۆشم."

عەلی مەندەهۆش ما ل دور وی تشتێ ب چاڤێن خوە دیتی و وێ چیرۆکا گوهلێبووی.

پاشی وی زەلامی گوت:

"وەرە هۆسا نە ڕاوەستە، وەرە دا پێکڤە چایەکێ ڤەخوین و پیچەکێ بەحسێ بازرگانیێ بکەین چونکی ئەز یێ پشتڕاستم کەسەکێ وەکی تە دێ شێت گەلەك پارەیان ب دەستخوە ڤە ئینیت."

عەلی سێ ڕۆژان ما ل مالا ڤی هەڤالێ خوە کو ناڤێ وی مەنسۆر بوو، عەلی هاریکارییا وی دکر ل دەمێ ڤەکرنا دوکانێ و خزمەتکرنا خەلکی و هندەك جاران ژی ب دەنگەکێ بلند بهایێ کەلوپەلان دگوت، ب شەڤێ دووبارە کەلوپەل ڕێکدخستن و دوکان دگرت.

جارەکێ مەنسۆری گوتێ:

"ئەرێ تە هزرا خوە کریە کو جارەکێ کارەکی بۆ ئیمامی بکەی؟"

عەلی گوت:

"هەلبەت من دڤێت، بەس ئەز کەسێ ل ڤێرێ نانیاسم و ئەز نزانم دێ چەوا خزمەتا ئیمامی کەم؟"

مەنسۆری گوتێ:

"تە خەم پێ نەبیت، ئەز گەلەك کەسان دنیاسم و ئەز و هەڤالێن خوە دێ هاریکارییا تە کەین."

پشتی هینگێ مەنسۆری هەڤنیاسین دناڤبەرا وی و جیرانەکێ خوە دا چێکر کو هاریکارێ پشکا پۆلیسان بوو ل وی تاخێ باژێری. دناڤبەرا شەڤ و ڕۆژەکان دا، عەلی خوە دیت ئەو زێرەڤانە ل زیندانا باژێری و مووچەیەکێ هەیڤانە وەردگریت، وی قەت ئەڤ چەندە باوەر نەدکر و هزر دکر ئەڤە خەونەکە ئەو تێدا دژیت.

تشتێ ژ هەموویان سەیرتر ئەو بوو دەمێ پشتی دەمەکێ کێم عەلی زانی کو ئاغایێ گوندێ کوپایێ، ئەرباب، ئەو زەلامێ زەنگین یێ سوڕەیایێ ل بچووکاتی ل دەڤ کاردکری یێ هاتیە زیندانکرن و یێ ئامادەیە هەر تشتەکی بدەت بەرامبەر ئازادکرنا خوە، ژبەر هندێ هەرچەند عەلی پارە پتر داخواز کربان، ڤی زەلامێ زەنگین ژبەر وی کاودانێ نەخۆش و شەرمزار یێ ئەو کەفتیە تێدا یێ ئامادە بوو ڤێ پارەی بدەت.

هەرچەندە عەلی چ پەیوەندی ب ئازادکرنا وی ڤە نەبوو و د شیانێن وی دا نەبوو، لێ دگەل هندێ ئەڤ چەندە نابیتە ئەگەرێ

چارەسەرکرنا ئاریشەیێ، چونکی ئاریشەیا سەرەکی ئەوە نوکە ل جهەکی ئاغا یێ د زیندانێ ڤە و مال و ملك و ئەردێ وی یێ ل جهەکی دی، ڤێجا عەلی دێ چەوا شێت خوە گەهینتە مالێ وی.

عەلی ئەڤ بابەتە دگەل هەڤالێ خوە مەنسوری ڤەکر، مەنسوری گوتێ:

"هشیار بی لەزێ د ڤی کاری دا نەکەی هەکە خەلك دێ گۆمانێ ژ کارێ مە بەن، ژبەر هندێ نوکە یا فەرە ئەم پیچەکێ بێهنا خوە فرەهـ بکەین و چاڤەڕیێ دەلیڤەیەکا گونجایی بین."

لێ ئاریشە ئاها ئەڤەیە، بێهنفرەهی نە ژ ساخلەتێن عەلی یە، ئەوی دڤێت هەموو تشتان ب لەز و د دەمێ خوە دا بکەت خوە هەکە چەند یێ ب مەترسی ژی بیت.

مەنسوری شیرەت ل عەلی کرن و گوتێ:

"ئاغایێ گوندێ تە نە کەسەکێ گرنکە، وی چ کارێن مەترسیدار نەکرینە. بەری دادگەهکرنا وی، گەلەك کەسێن دی دێ هێنە دادگەهکرن و سزادان، ئەو کەسێن ب ملیۆنان ڕیال دزین و خەلك برسی کری و نیڤا ئەردێ ڤی باژێری ب فێلبازی و گەندەلی ل سەر ناڤێ خوە تاپۆکری، گەلەك کەسێن هۆسا نە ب تنێ ل ڤێ زیندانێ بەلکو ل زیندانێن باژێرێن دی ژی هەنە و ل نێزیك دێ هینە سێدارەدان.

دبیت ل دەڤ تە و خەلکێ گوندێ تە ئەڤ زەلامە یێ ب قەدر بیت، لێ ل باژێری کەسێ ئاگەهـ ژێ نینە و بۆ کەسێ نە یێ گرنگە، ژبەر هندێ

بهێله ئەو پیچەکێ تام کەتە نەخۆشیا زیندانێ و پشتی بورینا چەند هەیڤەکان ئەو دێ گەلەك نەرم بیت و ل بەر داخوازیێن تە هێت.

ئاخفتنا مەنسۆری ڕاست دەرچوو، ژبەرکو دادگەهکرن و فەرمانا سێدارەدانێ گەلەك ب لەز برێڤە دچوون، دناڤ لیستێن ناڤێن تاوانبارێن سێدارەدایی دا، ناڤێ ئاغایێ گوندی دناڤ خوە یەکێ دا نەبوو، پشتی بورینا حەفتیەکێ ئێدی ئەڤ زەلامێ قەلەو هێدی هێدی لاواز دبوو و ژ مەزناهی و دفن بلنداهیا خوە دهاتە خوارێ.

وی هزرکر عەلی وی دپارێزیت و دێ د بەرژەوەندیا وی دا بڕیارێ دەت، لێ دگەل هندێ ژی وی دزانی کو دوور نینە د هەر دەمەکی دا بیت ناڤێ وی بهێتە گازیکرن و ژ ژوورا زیندانێ بهێتە دەرڤە و دادگەهکرن.

پشتی چەند هەیڤان، ناڤێ وی دگەل لیستەکێ دیار بوو ئەوێن تاوان دژی خەلکی ئەنجامداین و فەرمانا سێدارەدانێ ل سەر هاتبوو سەپاندن. هەرچەندە بۆ ماوەیەکی عەلی و مەنسۆر شیان وێ لیستێ بڤەشێرن یا ناڤێ ئاغایی تێدا یان ژی بدانن جهەکێ بەرزە هەتا ل دوماهیێ شیاین ب یەکجاری ناڤێ وی ژ لیستێ ژێببەن.

ل سەر وان یا پێدڤی بوو ئەو گەلەك ب لەز ڤی کاری ئەنجام بدەن نەخاسم دگەل دەرکەفتنا کەسەکێ نوو و بیانی ل سەر دەپێ شانویا ڕوودانان بۆ ماوەیێ چەند حەفتیەکان، هۆسا دیار بوو ئەڤ کەسێ نوو خۆدان دەستهەلاتەکا مەزنە ل سەر زیندان و پۆلیس و دادگەهێ.

ڤی زەلامی دیارکر کو ئەو یێ ژ تەهرانێ هاتی و وی پەیوەندیەکا باش و کەسایەتی دگەل ئیمام خومەینی هەیە و ئیمامی ئەو یێ ڕاسپاردی داکو کارەکی ل باژێرێ کرمانێ ئەنجام بدەت، ناڤێ ڤی کەسی لاجیفاردی بوو، هەروەسا ئەو مرۆڤێ یەك ژ وان کەسێن مەزن یێن ل سەر دەستهەلاتێ بوو.

هەرچەندە عەلی ب لەز پیلانەك دانا داکو ئاغایێ گوندی قورتال بکەت، لێ هەر زوو خەلکی گۆمان ژ ڤێ پیلانا وی برن چونکی عەلی خوە گەلەك نێزیکی وی دکر و سەرەدەریەکا تایبەت دگەل وی دکر. هەلبەت ئەڤ سەرەدەریا وی ژی چ نیشانێن هندێ پێڤە دیار نەبوون کو ئەو بەری هینگێ هەڤالێن یەك بن لەوڕا ژبەر هندێ بێهنا کارەکێ نهێنی ژ ڤێ خوە نێزیککرنا عەلی دهات.

هەموو ئەندامێن بلند یێن ڤێ زیندانێ کلیل و بەلگەنامەیێن کاغەزی و مۆرێن فەرمی یێن پێدڤی بۆ دەرئێخستنا هەر فەرمانەکا سەختە یا تایبەت ب ئاغایێ گوندی ڤە دگەل هەبوون ژبەر هندێ یا ب سانەهی بوو ئەو هاریکارییا وی بکەن داکو بڕەڤیت یان خوە قورتال بکەت.

دەمێ ڕۆژا دادگەهکرنێ هاتی، ئاغایێ گوندی بێی ترس چوو ژوورا دادگەهێ چونکی ئەو کەسێن ل وێرێ هەموو ئەو بوون یێن بەری هینگێ بەرتیل ژ ئاغایی وەرگرتین، لێ ئەو مەندەهۆش ما دەمێ فەرمانا سزادانا وی ب ڤی ڕەنگی هاتیە خواندن:

"ب ناڤێ خودایی، ڤێ دادگەهێ بڕیارا سێدارەدانێ ل سەر تە سەپاند و ئەڤ سزایە هەر ئەڤرۆ بەری ڕۆژ ئاڤا ببیت دێ هێتە بجهئینان."

پشتی سێدارەدانا ئاغایی، هەر وان کەسێن فەرمانا سێدارەدانێ بۆ دەرێخستی مال و ملکێ وی ل سەر خوە پارڤەکر و پشکەکا کێم یا مالێ وی گەهشتە عەلی ژی. دەهـ هزار ڕیال و تڕۆمبێلا وی و خانیێ وی یێ ل باژێری و خانیێ بابێ وی ل گوندێ کوپایێ و پارچەیەکا ئەردی گەهشتنە عەلی. هەروەسا دەلیڤە بۆ وی هاتە دان ئەو ئاڤا ڕووبارێ گوندی ژی بێی بەرامبەر بکاربینیت.

پشتی ڤێ چەندێ عەلی هەستپێکر ئەو یێ بوویە کەسەکێ گرنگ و خۆدان بها، هەر جهێ ئەو چووبایێ خەلك دا ژ پێش وی ڤە ڕابنەڤە و سلاڤ کەنێ و دا داخواز ژێ کەن چایەکێ یان شەربەتەکێ دگەل ڤەخۆن، بەروڤاژی بەرێ، نوکە خەلك ل دور وی خڕڤە دبن داکو خوە بکەنە هەڤالێن وی.

لێ هندەك کەسێن دی ژی خوە ژ وی دوور دکر. دەمێ عەلی دیتی کو کارێ وی ل زیندانێ وەك زێرەڤان نە یێ ب دلێ وی یە و نڤستن ژی ل ڤێرێ یا ب دلێ وی نینە و نەشێت ببیتە فەرمانبەر ل زیندانێ، وی نەخۆشی گەهاندە هندەك کەسێن دی، هندی ئەو دشیایی وی هاریکارییا هندەك زیندانیان دکر و ژ لایەکێ دی ڤە هەر گاڤا وی ڤیابا دا هندەك کەسێن دی کەتە د زیندانێ ڤە.

عەلی ل سەر ڤان چالاکیێن خوە یێن گۆماناوی یێ بەردەوام بوو و ئەو پارەیێ ژ ڤێ چەندێ ب دەستڤە دئینایی دگەل هەڤکارێن خوە یێن

بلندتر دابەش دکر یان ژی دەمێ وان ئاگەهـ ژێ نەدما هەما دا هەموویێ بۆ خوە ڕاکەت و نەدگوتە وان.

عەلی هەردەم جهێ پێشوازیکرنێ بوو ل مالا لەشفرۆشان ژبەرکو مەعمیلەکێ وان یێ بەردەوام بوو. هەروەسا ل وی جهێ باژێری ژی گەلەك یێ ب ناڤودەنگ بوو.

هەلبەت نوکە دەمێ ئەو ڤەدگەڕیتە گوندی ژی، ئەو نە عەلی بەرێ یە بەلکو نوکە کەسەکێ گرنگە و بەحس بەحسێ وی یە، هەر جهێ ئەو بچیتێ ژی بەحسێ چالاکییێن خوە یێن بازرگانی ل باژێری بۆ دکەت.

هەر ل وی دەمی، حکومەتا ئیرانێ بڕیاردا خەلکێ گوندی ژ نوکە وی ڤە دێ بنە خۆدانێن وان خانیان یێن ئەو تێڤە دژین و ئەو ئەردێن چاندنێ یێن ئەو تشتان لێ دچینن، هەروەسا بکارئینانا ئاڤا ڕووباری ژی ئێدی بۆ هەموو گوندیان بێ بەرامبەرە و هەر کەسەك دشێت بکاربینیت.

ل گوندێ کوبایێ، عەلی گوتبوو هەموو کەسان ئەو ڕێڤەبەرێ زیندانێ یە و وی کلیلێن هەموو هۆل و نڤیسینگەهـ و ژورێن زیندانێ یێن هەین، ژبەرکو وی شارەزایی د بابەتێ سەختەکرنا کاغەزێن زیندانێ و مۆرێ دا هەبوو، وی هندەك کەس بەرامبەر کوژمەکێ پارەی ئازاد کربوون.

ژبەرکو خەلکێ باژێرێ کرمان ب کێمی هەر خێزانەکێ، یەك ژ ئەندامێن خێزانا وان یێ د زیندانێ ڤە، لەوڕا گۆمان تێدا نینە ڕۆژەکێ ژ ڕۆژان ئەو دێ پێدڤی ب هاریکارییا عەلی بن.

هەر زوو عەلی حسابەکا بۆ خوە ل بەنکێ ڤەکر و پارەیێ وی ڕۆژ بۆ ڕۆژێ گەلەك زێدەتر لێ دهات، هەروەسا وی ڤاسەکا مەزن ژی بۆ خوە

کری داکو وان تشتان بکەتە تێدا یێن وی ژ زیندانیان وەرگرتین، زێدەباری هەلگرتنا چەکێن خوە یێن بەنکێ و زێڕ و پارە و گەلەك تشتێن دی یێن گرنگ و هەستیار.

پشتی هینگێ ب دەمەکی، عەلی کەفتە د ئەڤینیێ دا...

ئەو یەکەم جار بوو عەلی بکەڤیتە د ئەڤینا ژنەکێ دا، هەلبەت ئەڤ کچە نە وەکی وان ژنانە یێن وی بەری نوکە دیتین، نە خەلکا گوندێ وی یە و نەژی ل مالا لەشفرۆشان وی دیتی یە.

نەخێر، ئەو نوکە یێ ب وێ کچێ داخبار بووی ئەوا دهاتە سەرەدانا بابێ خوە ل زیندانێ. ئەو کچەکا جوان و دێم گەنمی بوو، چاڤێن وێ یێن شین و لێڤێن وێ یێن نازك عەلی ئێخستبوو داڤێن خوە.

لێ عەلی دێ چەوا شێت خوە گەهینتێ؟ ژیێ وێ چەندە؟ ناڤێ وێ چیە؟

ژیێ وێ کچێ دناڤبەرا چواردە بۆ پازدە سالان دا بوو، حەفتیێ دوو جاران ل سرایێ و ل بەر تیشکا ڕۆژێ یا دژوار ل بەرامبەر دەرگەهێ زیندانێ دگەل ژن و کچێن زیندانیان دڕاوەستیا.

پشتی هینگێ ب لەز عەلی پێزانین ل دور کۆمکرن، وی زانی کو بابێ وێ نۆژدارە و بەری نوکە ل یەك ژ ڕێڤەبەرێن مەزن ل باژێری ل سەردەمێ بەری شۆڕەشێ کارکریە و ئەو یەك بوو ژ پشتەڤانێن شاهی.

لێ ژبەرکو ئەڤ نۆژدارە خۆدان جهەکێ بلند و کەسایەتیەکا دیار بوو دناڤ خەلکی دا، دەستهەلاتدارێن شۆڕەشا ئیرانی بۆ ماوەیەکی بەلاٚ خوە

ژێڤە کربوو چونکی ئەو پێدڤی ب بسپۆریا وی یا پزیشکی دبوون، پاشی ڕۆژەکێ ل پایتەختی فەرمانا دەستەسەرکرنا وی دەرکەفت.

ل ڤێرێ عەلی هەڤنیاسین دگەل "مێهری"یێ کر.

ئێدی خەون و خۆزیێن عەلی بوونە مێهری و هەر شەڤ بەری بنڤیت هزرێن وێ دکرن، دەمێ ئەو دبەر مالا ژنێن لەشفرۆش ل سەر جادەیا دارفاسی ل باژێرێ زاهدان ژی ڕا دبوری، هزردکر ئەو یێ وێ د ژورەکا  وێ مالێ ڤە ددەتە بەر سینگێ خوە و بێهن دکەتە گولاڤا وێ. وی هزردکر ئەگەر وی هەڤژینەکا وەکی وێ یا جوان هەبیت، بەرپرسێن وی یێن کاری دێ نەچار بن پلەیا وی بلند کەن و جهەکێ گرنگتر دەنە ڤێ، دوور نینە وی بکەنە ڕێڤەبەرێ زیندانێ ژی.

ژ ئێدی وی ڤە عەلی دئینا پێش چاڤێن خوە کا چەوا وی ئەڤ هەموو سالێن چووین ژ ژیێ خوە ژ قەستا ل گوندێ کوبایێ بوراندن.

گەلەك جاران عەلی شەرم دکر بێژیتە هەڤالێن خوە یێن زیندانێ کو بابێ وی جووتیارەکێ بەلنگازە ل گوندی، بەلکو وی دگوتێ بابێ من کەسەکێ زەنگین و هێژایە و خۆدان دوکانەکا مەزن و کەرەکێ پەزی یێ مەزنە. د ڕاستی دا ئاخفتنا عەلی چ درەو تێدا نەبوون، چونکی پشتی سێدارەدانا ئاغایێ گوندی و بەلاڤکرنا مال و ملکێ وی، هندەك ژ مالێ وی گەهشتبوو بابێ عەلی ژی ئەوێ دگوتنێ لەتفەلاهـ، کو کەرەکێ پەزی و دوکانەکا بچووك ل گوندی هەبوون.

ل دوماهیێ هەر کار گەهشتە هندێ عەلی خوە ژ سوڕەیایێ دوور بکەت، ئێدی وی نەڤێت دگەل ژنەکا هەر زوو نیشانێن پیراتیێ ل سەر

دێمێ وێ پەیدابووین ژیانا خوە ببورینیت یان هیڤیان ژێ بکەت هەتا دوو پەیڤان دگەل باخڤیت.

عەلی بزاڤ دکر کەربێن وێ ڤەکەت ب هەر ڕێکەکا هەبیت، لەورا وەختێ دهاتە مال دا بەحسێ هەڤالێن خوە یێن ژن و کارێن خوە یێن دەهمەن پیسیێ دگەل وان ڤەگێڕیت، یان ژی دا بەحسێ وان جۆرێن ترۆمبێلێن گرانبها کەت یێن ئەو ل بازێرێ دهاژووت و کچێن جوان و بچووك ئەوێن جلێن تەنك و کورت دکەنە بەر خوە دگەل خوە سوار دکەت و بێهنا گولاڤێن وان وی سەرخۆش دکەت. سوڕەیایێ خوە بێدەنگ دکر و هۆسا خوە دیار دکر کو وێ گوهـ ل چ تشتان نەبوویە.

شەڤەکێ دەمێ عەلی هاتیە مال ب دەنگەکێ بلند گوت:

"دنیا خڕاب نابیت هەکە ئەز هەڤژینەکا دی بۆ خوە بینم و من پتر زارۆك هەبن، من دڤێت زارۆکێن من بچنە باشترین قوتابخانە و ئەز قوتابخانەیەکا هۆسا ل بازێرێ کرمان ڤێدکەڤم، دێ زارۆکێن خوە بەمە وێرێ چونکی دێ وان پاشەڕۆژەکا گەش هەبیت."

لێ دگەل ڤێ چەندێ ژی، هەڤژینا وی یا خەمگین ئەوا ل بەر ڕۆناهیا شەمالکەکێ خوە ب ڤەهاندنا گورەگێ بۆ زارۆکا خوە یا بچووك ڤە مژوول دکری دیسان خوە ب سەر ڤە بر و بەرسڤا وی نەدا.

لێ کوڕێ وی یێ مەزن، عەلی، گوتێ:

"باب ئەو کیژ کچکە تو دێ بۆ خوە ئینی؟ کا بۆ مە بەحسێ وێ بکە یا چەوایە؟"

عەلی سەحکرە هەڤژینا خوە و قورمەکا حێل  ل نارگیلێ دا و گوت:

"ئەو کچەکا گەلەك جوان و نازکە، خوە دێ بێژی ئەو کەڤالەکا هونەری یا بچووکە، هەروەسا کچەکا ڕەوشەنبیر و زیرەکە و بابێ وێ ژی نۆژدارە. مە هەردووکان هەڤدوو یا دیتی و ئەم یێن دگەل یەك ئاخفتین."

کوڕێ وی حسێنی ژی پرسیار ژێ کر:

"ئەرێ ژ ڕاست تە دگەل ئاخفتیە و گوتیێ دێ تە بۆ خوە خوازم؟"

عەلی بەرسڤ دا و گوت:

"بەلێ و گەلەك جاران ژی، هەر جارا ئەو دهێتە زیندانێ سەرەدانا بابێ خوە دکەت ئەز دەلیڤەیێ ددەمێ ئەو بهێتە ڕێزا دستپێکی، دەمێ ئەو من دبینیت و دگەل من دئاخڤیت هەست ب خۆشی و ئارامیەکا مەزن دکەت."

لێ د ڕاستی دا عەلی درەو دکرن چونکی هەتا وی دەمی ژی هێشتا وی پەیڤەکا ب تنێ ژی دگەل نەئاخفتبوو، لێ وی هەموو ڕێك بکاردئینان داکو هەڤژینا خوە بئازرینیت. وی هەموو ئەو فێل و ڕێك بکاردئینان یێن دهاتنە سەر هزرا وی ب تنێ دا هەڤژینا وی تشتەکی بێژیت یان کارەکی دژی وی بکەت لێ  بزاڤێن وی د بێ مفا بوون.

ڕۆژەکێ وی ترۆمبێلەك ژ بازێری ئینا و ژنەکا لەشفرۆش دگەل خوە سوار کر و بەرچاڤکەك و جلێن جوان کرنە بەر و ئینا ناڤ گوندی،

باشی بەرەڤ گۆڕەپانا گوندی چوو و سێ جاران ل دور وێ نافۆرێ زڤڕی یا دکەڤیتە نیڤەکا گورەپانێ و پاشی سلاڤ کرە هندەك کەسێن ناڤ گوندی ب تنێ دا سەرنجا وان بۆ خوە بڕاکێشیت. ل دووڤ دا وی ئۆڤەڕەکا ب هێز لێدا و تۆزەکا مەزن بلند کر.

دگەل ڤێ چەندێ هەموویێ ژی، گوندیان خوە نەڕازیکرن نەکر یان گازندە ژ ڤی کارێ وی نەکرن چونکی ئەو دترسیان وی دەست دگەل کەسێن سیاسەتمەدار هەبیت ل باژێری، ئەو دترسیان ڕۆژەکێ ئەو ب ڕێکا ڤان پەیوەندییێن خوە یێن سیاسی زیانێ بگەهینتە وان یان گوندێ وان، لێ دگەل هندێ ژی هەموویان دزانی ئەو کەسەکێ خڕاب و ب مەترسیە و یا باشترە خوە ژ وی بدەنە پاش.

کەسێ ژ هەموویان پتر ژ عەلی دترسیا، مەلا حەسەن بوو ئەوێ ئەڤە نە دەمەکێ درێژە هاتیە ناڤ گوندی، وی دیت کو عەلی کەسەکێ گەلەك تۆڕەیە و دوور نینە د هەر گاڤەکێ دا ئەو کارەکێ نەچاڤەڕێکری بکەت و زیانێ بگەهینتە خەلکی، ئەو دترسیا ڕۆژەکێ عەلی تۆڕەبوونا خوە هەموویێ د سەرێ وی ڕا بشکێنیت.

ل وی سەردەمێ نەخۆش، دەم بۆ دەمی هندەك کەس بەرزە دبوون و کەسێ نەدزانی کێ ئەو کوشتینە یان ڕەڤاندینە. هندەکان دگوت مەلا حەسەن ژی بەری بهێتە گوندی ل باژێرێ کرمان بوو، لێ ئەو نەچار بوو ژبەر هندەك ئەگەرێن نەدیار هەر زوو باژێری بجە بهێلیت ئەو ژی پشتی کو وی بۆ دوماهیك جار ژڤانەك دگەل قازیەکێ ئیسلامی هەی و پشتی ڤی ژڤانی ئێدی ئەو قازی بەرزەبوو و چ شوونوارێن وی نەمان، ژبەر

ڤێ چەندێ مەلای زانی بوو دێ گەلەك یا باش بیت هەكە ئەو پەیوەندیێن خوە دگەل عەلی ب هێز بكەت.

ل زڤستانا وێ سالێ، هەڤالا سوڕەیایێ یا نێزیك فەیروزە ژبەر نەخۆشیا پەنجەشێرا سیهان گیانێ خوە ژدەستدا و هەردوو زارۆكێن وێ و هەڤژینێ وێ هاشم مانە ب تنێ. هاشم هێشتا كەسەكێ جحێل و گەنج بوو و پسمامێ عەلی بوو، وی دوكانەكا بچووك ل گوندی هەبوو و هەر ژ زارۆكینیا خوە ل بەر دەستێ بابێ خوە وەك ئاسنگەر كاردكر. وی كارێ چاككرنا ترۆمبێلان و ڕێكخستنا تائیرێن ترۆمبێلان یان هەر كارەكێ دی هەبا دكر.

پشتی مرنا هەڤژینا وی، ئێدی ژیانا وی گەلەك نەخۆش و ب زەحمەت كەفت، فەیروزە ژنەكا باش و كابانیەكا مالێ یا سەركەفتی بوو و مالا وێ هەموو گاڤان یا پاقژ و ب سەروبەر بوو, لێ ئەڤ هەڤژینێ گەنج كو هێشتا ژ بچووكاتی دایكا وی مربوو و چ خووشك ژی نەبوون، ئێدی نەشیا چاڤێ خوە بدەتە زارۆك و مالا خوە.

ژبەر ڤێ چەندێ موختارێ گوندی و زەهرا و خەلكێ دی یێ گوندی داخواز ژ سوڕەیایێ كر ئەو بچیت مالا وی پاقژ بكەت چاڤێ خوە بدەتە زارۆكێن هەڤالا خوە و خوارنێ بۆ دروست بكەت بەرامبەر وەرگرتنا كوژمەكێ پارەی. هەلبەت ئەڤ چەندە گەلەك ب دلێ سوڕەیایێ ژی بوو.

سوڕەیایێ پشتی مالا خوە ب سەروبەر دكر، وێ ماف هەبوو ڕۆژێ دوو جاران بچیتە مالا هاشمی و خوارنێ بۆ زارۆكێن وی دروست بكەت و جلێن وان بشوت و سەروبەرێ مالا وی ڕێكبێخیت.

ئاها ئەڤە ئەو دەلیڤە بۆ عەلی هەلکەفت ب یەکجاری خوە ژ سوورەیایێ قورتال بکەت.

هەر جارا ئەو دهاتە گوندی، دا ب دزیکیڤە ل دووڤ وێ چیت و هندەك تەڵهان بۆ ڤەدەت، لێ سوورەیایێ قەت ئاگەهـ ژ ڤان پیلانان نەبوو یێن هەڤژینێ وێ دژی وێ ئەنجامددابن.

هێدی هێدی، ئێدی ل هەموو کونج و قولاجکێن گوندی گوتگوتکێن بێ بەختیێ د دەرحەقا سوورەیایێ دا بەلاڤ بوون.

# بەشێ سێیێ

دەمێ مەلا حەسەن هێدی هێدی بەرەڤ مالا ئاغای ڤە دچووی، ب رێکێ ڤە ئەو ڕوودان هاتنە بیرا وی یێن ل سالێن بورین ڕوودایین و بووینە ئەگەر ژیانا وی بەرەڤ ئاسۆیەکێ دی ڤە بچیت. هەموو تشت گەلەك ب لەز هاتنە ڕوودان و کەسێ بەری هینگێ پێشبینیا ڤان گوهۆڕینان نەدکر.

ژیانا مەلا حەسەنی پشتی کەفتنا شاهی ب یەکجاری سەروبن بوویە و هاتیە گوهۆڕین، ژ نیشکەکێ ڤە هندەك کەسێن دوهی ل سەر جادەیان پیاسە و کارێن خراب دکرین، ئەڤرۆکە یێن بوینە بەرپرس و چووینە سەر کۆرسیکا دەستهەلاتێ.

دناڤبەرا شەڤ و ڕۆژەکان دا دەرگەهێن زیندانان هاتنە ڤەکرن و تاوانبار هاتنە ئازادکرن ئەو تاوانبارێن تێهنی بۆ تۆلڤەکرن و کارێن خراب. بدەرکەفتنا ڤان زیندانیان ئێدی بەلاٚ و نەخۆشی و ئاریشە ژی بەلاٚڤبوون. هندەك ژ خەلکێ دەڤەرێن باشووری هێرش کرە سەر دەڤەرێن باکووری کو خانی و ڤیلە و کۆچکێن جوان و بەرکەفتی لێ هەبوون، زێدەباری خوارنگەهێن گرانبەها و ئۆتێلێن مەزن.

ل زیندانا باغ شاە یا لەشکەری ئەوا حەسەن لاجیڤاردی لێ هاتیە زیندانکرن، ژ نیشکەکێڤە حەسەنی گوه ل دەنگێ شەڕی دناڤبەرا هێزێن لەشکەری یێن سەر ب دەستهەلاٚتا شاهی و هژمارەکا مەزن یا خەلکێ نەڕازیبووی ژ حکومەتێ بوو. دەمێ پێلێن شەڕی گەرم بووین و خەلکی

دەوروبەرێن زیندانێ دورپێچ کرین، حەسەنی د پەنجەرکا زیندانێ ڤە تەماشەی دەرڤە کر، وی دیت لەشێ دوو سەربازێن کوشتی ل سەر وێ بەفرا سپی یا دناڤ باخچەیێ زیندانێ ڤە یێن درێژ بووین، هەروەکی دوو خالێن ڕەش ل سەر بەرپەڕەکێ سپی.

ل دووڤ دا، دەنگێ لڤینا کلیلان د دەرگەهی ڕا هاتە گوهێن وی، وی زانی ئەڤە هندەك کەس هاتن و دێ قوفلەیێن دەرگەهێن ژورێن زیندانیان ڤەکەن، هەروەسا وی گوهـ ل دەنگێ پێلاڤێن هندەك کەسان بوو ددانانە دەرگەهان. دەرگەهێ ژوورا وی هاتە ڤەکرن و سێ کەسێن چەکدار دیار بوون.

یەك ژ وان گوت:

"هوون چەند کەس د ڤێ ژورێ ڤەنە؟"

زیندانیان بەرسڤ دا و گوت:

"ئەم پێنج کەس یێن د ڤێ ژورێ ڤە."

هەر وی کەسی گوت:

"یەلا هەر نوکە بکەڤنە بەری مە و خوە ڕێز کەن."

ل دووڤ دا وی کەسی سێ پێنگاڤ هاڤێتن و پاشی ب هووری تەماشەی سەروچاڤێن زیندانیان کر.

پرسیار ژێ کر:

"کی ژ هەوە خواندن و نڤیسنێ دزانیت؟"

سێ ژ وان پێنچ کەسان دەستێ خوە بلند کر.

پاشی پرسیار ژێ کر:

"چەند ژ هەوە باوەرنامەیا ناڤنجی هەیە؟ ئەرێ یەك ژ هەوە گەهشتیە قۆناغا کۆلیژێ؟"

ل ڤێرێ ب تنێ حەسەنی بەرسڤا وان ب "بەلێ" دا.

- باشە مادەم تو گەهشتیە ڤێ پلەیا زانستی، تە چ کار ب زانستێ خوە کریە؟ مەرەما من تو ئەی پیرەمێر، ئەرێ تو مامۆستای؟
- نەخێر

وی کەسێ چەکدار تڤەنگا خوە نێزیکی سەری وی کر و گوتێ دێ بێژی "نەخێر هێژایێ من."

حەسەنی گوت:

"نەخێر هێژایێ من، لێ من باوەرنامەیەك هەیە کو رێکێ ددەتە من ئەز وانەیان بێژم و بۆ ماوەیەکێ کێم من کارێ مامۆستایەتیێ ژی کریە."

- باشە تو زمانێن بیانی دزانی؟
- ئەز زمانێ تورکی دزانم و پیچەکا زمانێ عەرەبیێ ژی، تا رادەیەکی زمانێ ئینگلیزی ژی دزانم لێ ئەز نەشێم پێ باخڤم.
- ژیێ تە چەند سالە؟

- پێنجی و سێ سال، هێژایێ من.

زەلامێ چەکدار تڤەنگا خوە دانا و چەند پێنگاڤەکان بەرەڤ پاشڤە چوو، پاشی دووبارە پرسیار ژێ کر

- باشە بۆچی تو ئینایە ڤێرێ؟ یان ژی تو دگەل دەزگەهێ ساڤاك کاردکەی؟
- نەخێر هێژایێ من، ئەز سوند دخۆم بۆ تە کو وان ئەز ب شاشی ڤە ئینایمە ڤێرێ.

وان زەلامێن چەکدار هەموویان پێ کرە و گوتێ:

"هوون هەموو ڤی تشتی دبێژن ئەی کەسێن ترسنوك و بێخێر، نوکە ئەم دێ زانین کا کی ژ هەوە ڕاست دبێژیت و کی درەوان دکەت. نوکە ئەز دێ سەحکەمە فایلێن هەوە، هەر گاڤا بۆ من دیار بوو تە درەو یێن کرین تو دێ تووشی ئاریشەکا مەزن بی."

پشتی هینگێ زەلامەك ژ وان ب تڤەنگا خوە پالەك ل حەسەنی دا و بەرەڤ هۆلەکێ ڤە بر، پشتی چەند چرکەیان، حەسەنی خوە د هۆلەکان مەزن ڤە دیت کو ب ڕۆناهیا نیونێ هاتبوو ڕۆهنکرن و یا پڕ بوو ژ زیندانیان.

پاشی دەنگەك هاتێ:

"هوون هەموو بڕوونە خوارێ و گوهێن خوە باش ڤەکەن."

پشتی هینگێ هەتا سپێدێ هەر بێهن بێهنە گازی یەك ژ وان دکر و بەرسڤێن وان دوەرگرتن، ئەگەر بەرسڤا یەکی یا ڕەوا نەبایە یان ب دلێ

وان نەبایە، دووبارە دا وی فرێکەنە د ژوورا وی یا زیندانێ ڤە، هەتا وان هندەك زیندانی دقوتان ژی.

پشتی هینگێ گەڕا حەسەنی هات، ئەوێ ژ شڤێدی دی وەرە چ تشت نەخوارین و نەنڤستی، ژبەر هندێ گەلەك یێ واستیایی بوو و نیشانێن بێهنتەنگی و نەخۆشیێ ل سەر دێمێ وی د دیار بوون.

ناڤێ وی هاتە گازیکرن: "لاجیفاردی... حەسەن لاجیفاردی."

ڕابوو سەر پێن خوە و گوت:

"ئەڤە ئەزم هێژایێ من."

پاشی بەرەڤ سەکویێ هۆلێ چوو کو سێ زەلامێن چەکدار ل سەر دڕوونشتی بوون و هەر یەك ژ وان بەدلەکا لەشکەری ل بەر بوو و دەرسوکەکا فەلەستینی ل دور حەفکا خوە ئالأندبوو.

یەك ژ وان گوتێ:

"تو خۆدانێ فائیلا 58\7865 ی، تو یێ هاتیە گونەهبارکرن ب تاوانا سەختەکرنا فایلێن فەرمی و گەندەلی و دزی و دەرێخستنا هندەك چەکێن بەنکێ یێن بێ پارە و ڕەڤین و خوە بەرزەکرن ژ یاسایێ و چەندین تاوانێن گرێدایی نامیسێ ....."

ڤان هەرسێ کەسێن دادگەه برێڤە دبری تەماشەی هەڤدوو کرن.

یەك ژ وان گوت:

"سەیرە ئەڤ تاوانە هەموو ل سەر فائیلا کەسەکی ب تنێ هاتبنە نڤیسین، ئەرێ تە ب تنێ ئەڤ کارە ئەنجامداینە؟"

حەسەنی گوت:

"ئەز دووبارە بۆ هەوە سووند دخۆم کو خوە من یەك ژ ڤان تاوانان ئەنجام نەدایە و ئەو چەندە نە ژ ڕەوشتێ منە، من گوتە دادوەرێ بەری نوکە ژی لێ وی باوەر ژ من نەکر."

- باشە ئەڤە ژ کەنگی وەرە تو ل ڤێرێ؟
- ل کیرێ؟ ڤێرە؟ ل زیندانا باغ شاهـ؟ ئەڤە ماوەیەکێ درێژ نینە، ب تنێ ئەڤە دەهـ ڕۆژن، لێ بەری نوکە حەفت هەیڤان ئەز ل زیندانان "غەسر" بووم.
- مەرەما تە ئەو کەسێ دادگەها تە بڕێڤەبری یەك ژ دادوەرێن شاهێ بەرێ بوو.
- بەلێ ڕاستە.
- باشە پا ئەم چەوا باوەر ژ تە بکەین؟
- چونکی هەموو تشت ل وێرێ د نڤیساینە دناڤ فائیلا من دا و من ب دەستێ خوە بەروارا وێ ڕۆژێ یا ئیمزا کری.

ئەو هەرسێ زەلام چوونە بن گوهێ هەڤدوو و پاشی یێ نیڤەکێ گوت:

"تە دڤێت دگەل مە کار بکەی؟"

حەسەنی گوت:

"چەوا؟ دگەل هەوە کار بکەم؟ مەرەما تە چیە ژ ڤێ ئاخفتنێ؟"

یەك ژ وان زەلامان بەرسڤا وی دا و گوت:

"مە دڤێت تو بۆ کۆمارا نوو کاربکەی ئەوا مە ل بەرە بدامەزرینین، ئەو ژی کو تو هاریکارییا مە بکەی ئەو کەسێن پشتەڤانیا شاهی دکری و دووکەفتییێن وی داکو ئەم ب هەموو ڕەنگان خوە ژ وان خلاس بکەین."

— هەلبەت، هەلبەت من دڤێت دگەل هەوە کار بکەم، من دڤێت بێژمە هەوە کو ئەو زیندانا ئەز تێڤە دوو ژ وان کەسان یێن دگەل من، ڕەنگە سێ کەس ژی یان پتر بن.

ئێدی حەسەن لاجیفاردی دەست ب کارەکێ نوو کر، هەر زوو پلەیا وی یا کاری هاتە بلندکرن، ژ نڤیسەرەکێ سادە بۆ وەرگێڕەکێ ب لەز و پاشی بۆ دەنگوباس گەهینەرێ پۆلیسێن ئیسلامی و پاشی بۆ کرێگرتیەکێ نهێنی یێ پۆلیسان و پاشی بۆ بەردەڤکێ فەرمی ب ناڤێ داواکارێ گشتی یێ شۆڕەشێ و دوماهیێ ژی بۆ نوونەرێ خومەینی ل وان گوندێن دکەڤنە باکوورێ وەلاتی، ئەڤ پێشکەفتنێن کاری هەموو ب تنێ د ماوەیێ دوو سالان دا ڕوودان.

هەر زوو حەسەن شیا شوونوارێن هەموو وان فائیلان ڤەشێریت یان نەهێلیت یێن تاوانێن وی تێدا هاتینە تۆمارکرن و ل شوونا وان هندەك فائیلێن دی یێن سەختە دانانە جهێ وان کو چ تاوان تێدا نەهاتبوونە توماکرن.

هەرچەندە چەندین جاران بەری هینگێ ئەو ژبەر تاوانێن دزی و گەندەلیێ هاتبوو گونەهبارکرن و سزادان، لێ هەر زوو ئەو شیا ڤان تاوانان هەموویان ڤەشێریت و خوە ب کەسەکێ پاقژ بدەتە نیاسین، دگەل هندێ ئەوی ناسنامەیا خوە یا بەرێ نەگوهارت، ئانکو ناڤ و کەسایەتیا خوە هەر پاراستن لێ ب تنێ وی شێوەیێ خوە یێ ژ دەرڤە گوهارت.

ئێدی وی ژی دەرسوکەك کرە سەرێ خوە و چاکیتەکێ تەنك و درێژ دانا سەر ملێن خوە و پێلاڤەکا ژ داڤێن گینیکی دروستکری کرە پێن خوە.  هەروەسا بەردەوام دانەیەکا  قورئانێ و تسبیحان د دەستێ وی دابوون، بەرچاڤکەکا نیمچە ڕەش ژی ل بەر چاڤێن وی بوو، ڤان تشتان هەموویان دیمەنێ مامۆستایەکێ ڕەوشەنبیر ل دەڤ وی پەیداکر.

هەتا ڤێ قۆناغا ژیێ وی ژی، هێشتا حەسەن یێ زگورد بوو و ژیانا هەڤژینیێ پێك نەئینابوو. لێ پشتی هینگێ وی هزرا خوە د ژن ئینانێ دا کر، هەلبەت نە هەما ژن ئینانەکا سادە و ئاسایی، بەلکو وی بۆ خوە ل هەڤژینەکا خۆدان بها و پلە و پایە دگەڕیا ژبەرکو نوکە ئەو یێ ل جهەکێ بلند.

ل دوماهیێ وی بیژنەکا زەنگین و گەنج دیت کو گەلەك یا دەولەمەند بوو، خانیەکێ مەزن ل بەر لێڤا دەریایێ هەبوو، زێدەباری باخچەکێ مەزن و زەڤیەکا برنجی. پاشی وی ترۆمبێلەکا گرانبها بۆ خوە کڕی و هندەك جلێن زەلامێن ئایینی یێن جوان و ب بها کرنە بەرخوە و ئەو قورئانا د دەستێ وی ژی دا ب ئاڤا زێڕی و بەرێن گرانبها هاتبوو نەخشاندن.

ل وی دەمی حەسەن د ژیانەکا گەلەك خۆش و بەختەوەر دا دژیا، دبیت ئەڤ ژیانا وی یا خۆش هەتا هەتایێ یا بەردەوام بایە ئەگەر وێ ڕۆژێ ژ نیشکەکێ ڤە ئەو هەڤالێ وی یێ شیعە و خۆدان پلە نەهاتبایە سەرەدانا وی ل مال، ژبەرکو هاتنا ڤی هەڤالی بوو ئەگەر ئاراستێ ژیانا وی هەمو بهێتە گوهۆڕین.

دەمێ هەڤالێ وی سەرەدانا وی ل مال کری، مەندەهوش ما ژبەر وێ ژیانا حەسەن تێدا دژیت ژبەرکو ئەڤ چەندە ب چ ڕەنگان دگەل بنەمایێن شۆڕەشا ئیسلامی یا ئایینی ل ئیرانێ نەدگونجا. حەسەن زەلامێ ئێکانە بوو د وی خانیێ هندە مەزن و خۆش ڤە دژیا. د ڤی خانیێ ڤە، نە ب تنێ ئەو دگەل هەڤژینا خوە و کچا وێ دژیا، بەلکو خەسیا وی و دوو خزمەتکار ژی دناڤ مالا وان دا بوون و هەڤسوویەکێ وان ژی چاڤدێریا باخچەیێ وان دکر.

دەمێ ئەڤ کەسێ شیعە هاتیە د ژوور ڤە، وی دیت حەسەن یێ ل سەر جۆلانکەکێ پاڵدایە و دوو کچێن گەنج ب بەلگێن دار ڤەسپێ یێ بای ل وی دکەن و هەر زوو گەنگەشەیێ دناڤبەرا وان دا دەستپێکر.

پشتی هەیڤەکێ ژ ڤێ گەنگەشویا وان، بڕیار هاتە دان حەسەن ژ پۆستێ وی بهێتە لادان و هەموو مال و ملکێ وی ژێ بهێتە وەرگرتن، لێ ژبەرکو وی ب خوە چ تشت نەبوو و ئەو مال نە یێ وی بوو، لەوڕا ڕۆژەکێ سپێدی زوو شیا ژ گوندی دەرکەڤیت و چەندین کەلوپەلێن گران وەك گوستیرك و بازنك و ڕستکێن زێڕی و هژمارەکا مەزن یا پارەی ژ هەڤژینا خوە بدزیت و بکەتە د چانتەکی دا و دگەل خوە ببەت پاشی هەر زوو

خوە گەهاندە وێ پاسێ یا بەرەڤ باژێرێ "چالوس" دچووی بێی کو نیشانێن ڕەڤینێ ل سەر دێمێ وی دیار ببن.

حەسەن لاجیفاردی کەسەکێ هەڤڕەگەزباز بوو، پشتی پۆلیسان ل سەر دەمێ شاهی بەلگە ل سەر وی بدەستڤە ئینایین کو نە ب تنێ وی دەستدرێژیا سێکسی دکرە سەر وان قوتابییێن کچ یێن ل بەر دەستێ وی دخواندی بەلکو وی دەستدرێژی کریە سەر هندەك کوڕێن بچووك ژی، ئەو ژ چەندین قوتابخانەیان هاتبوو دوورئێخستن هەتا ل دوماهیێ کار گەهشتیە هندێ وەزارەتا پەروەردە و فێرکرنێ بڕیاردا ئەو ب یەکجاری ژ کارێ مامۆستایەتیێ بهێتە لادان.

پشتی ب ڤان تاوانان هاتیە گونەهبارکرن، وی بەردەوام خوە ژ پۆلیسان دڤەشارت و هندی دشیایی دڕەڤی لێ ل دوماهیێ هاتە گرتن و حوکم کرن بەری چەند هەیڤەکان ژ دەستپێکرنا شۆڕەشێ ل ئیرانێ.

پشتی ئەو بۆ ماوەیێ دوو سالان دگەل هەڤژینا خوە یا زەنگین ل سەر لێڤێن دەریا قەزوین ژیایی، ئەو شیا وێ سپێدەهیێ ژ گوندی بڕەڤیت و بەرەڤ باشوورێ وەلاتێ بچیت هەتا گەهشتیە باژێرێ قوم یێ پیرۆز.

ل دووڤ دا، بۆ ماوەیێ دوو سالێن دی ل باژێرێ "یەزد" ژیا کو باژێرەکێ زەرادەشتی بوو و خەلکێ وێ ببوونە موسلمان، هەروەسا دهێتە هەژمارتن پرەکا بازرگانی ل سەر لێڤێن بیابانێ. ئەڤ جهە گەلەك یێ ب دلێ حەسەنی بوو ژبەرکو وی دزانی ل ڤی جهی دەستهەلاتدارێن ئیرانێ ب یەکجاری دێ وی ژبیرکەن.

پاشی وی چەندین کارێن جودا جودا ئەنجامدان ب تایبەت ل مزگەفتێ، پاشی وەك ڕێبەرێ گەشتیاری ل سەر گوڕێ شەمسەدینی کارکر، ئەڤ کارە هەموو ئەنجامدان بەری کو بۆ جارا دووێ ژیانا هەڤژینیێ پێك بینیت. ڤێ جارێ وی ژنەکا دی یا بیژن بۆ خوە ئینا کو زەلامێ وێ یەك ژ پشتەڤانێن شاهی بوو و ژ لایێ دەستهەلاتدارێن نوو یێن ئیرانێ ڤە هاتبوو سێدارەدان.

ل ڤی بازێرێ پیرۆز یێ تامدای ب ژیانەکا بەختەوەر، حەسەنی ژیانا خوە ب ئاوایەکێ ئاسایی و بێ ئاریشە دبوراند، هەڤژینا وی یا نوو ژی ژبەرکو یا زەنگین بوو، هەموو پێدڤی و داخوازیێن وی بۆ بجهـ دئینان. دبیت ئەڤ جارە ژی حەسەن شیابا ب خۆشی هەتا هەتایێ بژیت هەکە وی یەك ژ هەڤالێن خوە یێن بەرێ ل زیندانا "غەسر" نەدیتبا کو د ڕاستی دا دگەل وی د یەك ژوورا زیندانێ ڤە بوون.

ژبەرکو هەموو خەلکێن گوندان دەنگوباسێن هەڤدوو دزانن تا وی ڕادەی هەر یەك دزانیت کا هەڤسوویێ وی بۆ خوارنا نیڤرۆ چ خوارن لێنایە، لەوڕا هێشتا نەبوویە ئێڤار خەلکێ گوندی هەموویان زانی کو بەری هینگێ لاجیفاردی د زیندانێ ڤەبوو، ئەڤ هەردوو هەڤالە ژبەر تاوانێن دزی و گەندەلیێ هاتبوونە زیندانکرن لێ ئەگەر شۆڕەش نەهاتبایە کرن ڕەنگە هەتا ئەو مابانە د زیندانێ ڤە.

دووبارە حەسەن لاجیفاردی ما ب تنێ و هەڤژینا وی خوە ژێ دا بەردان، لێ ڤێ جارێ ژی ئەو شیا هندەك پارەیان ژ گەنجینەیا هەڤژینا

خوه ب دزیت و ژ وێرێ ژی بڕەڤیت و پاشی ژ گوندەکی د چوو گوندەکێ دی بێی کو کەس ڕابردوویێ وی بزانیت.

ڕۆژەکێ ل ئێڤاری ئەو گەهشتیە باژێرێ کرمان و چانتەیێ وی پێ جلکان د دەستەکێ وی دا بوو و د دەستێ دی ژی دا قورئانەك و هندەك زێڕ تێدا بوون، ل باژێرێ کرمان ژی وی وەك ڕێبەرێ گەشتیاری ل کەلها "قوبەیا کەسك" و مزگەفتا "باهیناز" کاردکر، پاشی ئەو شیا ببیتە مامۆستا ل قوتابخانەیا "سعدات" ل کەرتێ ڕۆژهەلاتی یێ باژێرێ ب مووچەیەکێ باش کو ل وێرێ ئایەتێن قورئانێ و حەدیس و ژیاننامەیا پێغەمبەری (سلاڤێن خودایی ل سەر بن) بۆ قوتابیان شرۆڤە دکر.

ب ڕێکا ڤی کاری، وی زانی کو ئێدی دەلیڤە بۆ وی هەلکەفت ئەو کارەکێ نوو بکەت کو بەری هینگێ وی نەکریە. ژبەرکو وی زمانێ عەرەبی دزانی، وی دەستپێکر ئایەتێن قورئانا پیرۆز ژبەر بکەتن هەروەسا ئەو گۆڤار و ڕۆژنامەیێن عەرەبی یێن دهاتینە باژێری دخواندن و ئێدی خوە فێری گوتنا وان پەیڤان دکر یێن زەلامێن ئۆلی دبێژن.

هەرچەندە ئەو ب خوە کەسەکێ علمانی بوو، لێ هێدی هێدی وی دیت ئەو یێ دهێتە گوهۆڕین و دبیتە کەسەکێ ئاییندار و جهگرێ پێغەمبەری (سلاڤێن خودێ ل سەر بن) ل وی باژێری.

ل وی دەمی، حەسەنی ژورەك دناڤ مالەکێ دا ب کرێ گرت و خوارن و ڤەخوارنا وی ژی دگەل وێ مالێ بوو، هەروەسا وی وانەیێن تایبەت ددانە کوڕێ وان یێ بچووك.

سەرێ حەسەنی یێ سپی بوو و ڕهـ و سمبێلێن وی وەکی یێن مەلایەکی بوون و خۆدان هەیبەتەکا مەزن بوو، ئەو ب خوە ژی کەسەکێ درێژ بوو و ڤێ چەندێ هاریکارییا وی دکر ئەو تشتێ وی دڤێت ب سانەهیتر بگەهیتێ. لێ ل پشت جامێن بەرچاڤکا خوە یا ڕەش، وی وەکی باڵندەیەکێ بریندار خوە دڤەشارت.

حەسەن شیا خوە ژ پایتەختی و دادگەهێن شۆڕەشێ قورتال بکەت، وی هەموو هێز و شیانێن خوە دمەزاختن داکو بشێت کەسایەتیەکا باش و جوان بۆ خوە د چاڤێن وان کەسان دا ئاڤا بکەت یێن ئەو دناڤ دا دژیت، هەروەسا وی بزاڤێن مەزن دکرن ئەو خوە بگەهینتە مەلایێ مزگەفتا "ئەلجومعە" لەوڕا هەموو گاڤان دچوو وێرێ.

ئەڤ مزگەفتە بنگەهێ ئەنجامدانا هەموو کاران بوو، هەموو ئەو ئاریشەیێن ل باژێری دڕوودان ل ڤێ مزگەفتێ دهاتنە چارەسەکرن. ئەڤ ئاریشە هەموو ب ڕەخ وێ نافۆرەیا دناڤ باخچەیی دا پشتی ب دوماهی هاتنا نڤێژی دهاتنە گەنگەشەکرن.

ل ڤی جهی سێ بابەتێن سەرەکی دهاتنە گەنگەشەکرن: پێشکێشکرنا نەڕازیبوون و گازندەیێن خەلکی بۆ دەستهەلاتداران، گرێدانا پەیمان و دەستەسەرکرنا مال و ملکی و پێشکێشکرنا حالەتێن بەردانێ یێن ب لەز، هەروەسا هەر تشتەکێ بهێتە کڕین یان فرۆتن یان کرێکرن.

دگەل ڤەخوارنا کوپێ چایێ یێ چوارێ، ژ نوو یەك ژ زەلامێن ئایینی دێ بێژیتە تە فەرموو داکو گوهێ خوە بدەتە ئاریشەیا تە، لێ ئەو زەرفێ بۆ خرڤەکرنا پارەی دهاتیە تەرخانکرن، دەستەکی بۆ دەستەکی

دهاتە ڤەگوهاستن و هەر یەکی پارەیەك دکرە تێدا هەتا ل دوماهیێ گەهشتیە جهێ خوە یێ جێگیر کو ئەو ژی دچوو دناڤ بەریکا مەلای دا.

حەسەن کەسەك بوو دشیا خوە گەلەك ڕەزیل بکەت و د هەمان دەم دا یێ فێلباز ژی بوو، ئەو بەری نوکە چەندین جاران شیابوو مفای ژ ڤان هەردوو ساخلەتێن خوە وەربگریت ب تایبەت دەمێ دگەل ڕێڤەبەرێن وان قوتابخانەیان دئاخفتی یێن وانە لێ دگوتن، یان ژی دگەل دەستهەلاّتدارێن شاهی یێن بەرێ، هەروەسا ژ مێژە نەبوو دەمێ وی ئەڤ چەندە دگەل زێرەڤانێ زیندانێ ژی بکارئیناى. گۆمان تێدا نینە کو ئەو د مەزنکرن و مەتحە و پەسنا کەسێ بەرامبەر دا گەلەك یێ شاهڕەزا بوو.

پیچ پیچە ئەو شیا باوەریا کەسێن دەوروبەری خوە ب دەستڤە بینیت، ماوەیەکێ درێژ پێڤە نەچوو، وی هند خوە دیت ئەو ژی یێ بوویە یەك ژ وان کەسان یێن ئاریشەیێن خەلکی چارەسەر دکەن.

حەسەن شیا وەل خوە بکەت کەس ب سانەهی خوە ژێ دوور نەکەت بەلکو هەموویان هۆسا هەست پێدکر ئەو کەسەکێ گرنگ و تێگەهشتیە. ژبەر وان هاریکاری و شیرەتێن ئەو پێشکێشی خەلکی دکەت، مەلای بڕیار دا وی خەلات بکەت و مێهڤان کەتە مالا خوە بۆ خوارنا شیڤێ.

دەمێ خەلکێ سادە و ئاسایی زانی کو وی پەیوەندییێن باش هەنە، داخواز ژێ دهاتی کرن ئەڤە بۆ وان ناڤبژیڤانییێ ل دەڤ دەستهەلاتدارێن سیاسی و مەزنە زەلامێن ئایینی بکەت، ئاها ل ڤێرێ یەکەم کارێ وی دەستپێکر، ئەو ژی ببیتە ناڤبژیڤان.

د ماوەیەکێ کێم دا پارەیێن وی بوونە گەلەك، هەرچەندە پارەیێن وی گەلەك ژ کەسێن سەر وی دا کێمتر بوون لێ وی دزانی دێ چەوا مفای ژ ڤێ دەلیڤەیێ بینیت.

ژبەرکو ئەو گەلەك یێ ل خوە هشیار بوو و گۆمان ژ هەموو تشتان دبر، لەورا ڕەوشا وی ژی وەکی حالێ گەلەکێن دی بوو ئەوێن هێدی و ب هشیاری ل دەرەجکێن جڤاکی سەردکەفتن. باوەریا وی ب بەنکان نەدهات پارەیێ خوە بکەتە تێدا ژبەر هندێ وی دڤیا ئەو ب خوە پارەیێ خوە بهەلگریت.

ژبەرکو پارەیێن وی بوونە گەلەك و ئێدی ئەو نەدشیا هەموویان بهەلگریت، وی پارەیێن خوە دگەل پارچەیێن زێڕی گوهۆڕین، ل دووڤ دا وی بۆ خوە قائیشەکا پشتێ کری کو ئەڤ قائیشە د تایبەت بوون ژ بۆ هەلگرتنا پارە و زێڕان، وی چ جارا ئەڤ قائیشە ژ پشتا خوە ڤەنەدکر خوە هەکە چووبایە دەستشوویێ ژی.

دەمێ سەرۆکێ پەرلەمانێ ئیرانێ ب سەرەدانەکێ هاتیە باژێرێ کرمان کو جهێ ژ دایکبوونا وی بوو، حەسەنی بڕاڤ دکر ب هەموو ڕەنگان خوە نێزیکی وی بکەت و دگەل وی ڕاوەستیت و خوە ل بەر وی شیرین بکەت. پشتی کو ڤان هەلکەفتنان بۆ ماوەیێ سێ ڕۆژان ڤەکێشاین، سەرۆکێ پەرلەمانی بڕیاردا دیدارەکا کەسایەتی دگەل مەزنە بەرپرسێن باژێرێ گرێدەت ئەوێن خزمەتا شۆڕەشێ و ئیمام خومەینی کرین.

حەسەنی ژ نیشکەکێ ڤە دیت ئەو یێ د وێ ژوورا کۆمبوونان ڤە ل بنگەهێ سەرەکی یێ پۆلیسان یا کو هژمارەکا کەڤالێن داری تێدا هاتینە

هەلاویستن. تشتێ سەیر ئەو بوو حەسەن ژی یەك ژ وان سەد مەزنە کەسێن ئایینی و بەرپرس و زەنگینان بوو یێن دگەل سەرۆکێ پەرلەمانی کۆمبووین، لێ وی ب خوە چ ژ ڤان کەسان بەری نوکە نەدنیاسین.

دەمێ گەرا حەسەنی هاتی داکو خوە بۆ سەرۆکێ پەرلەمانی بدەتە نیاسین، مەلایێ بەرێ یێ مزگەفتێ ب ڤان پەیڤان ئەو دا نیاسین:

" هێژایێ من، دەلیڤەیێ بدە من ئەز حەسەن لاجیفاردی بۆ تە بدەمە نیاسین، ئەو کەسەکێ ڕاستگۆ و دەستپاکە و یەکە ژ کەسێن پایەبلند ل باژێری و مامۆستایەکێ زیرەکە."

سەرۆکێ پەرلەمانی بۆ حەسەنی گرنژی و گوتێ:

"ئەز دەستخۆشیێ ل تە دکەم بۆ وی کارێ پێ ڕادبی، هەلبەت زارۆك و گەنجێن مە پێدڤی ب مامۆستاییێن وەکی تەنە داکو وان پاشەڕۆژەکا گەش هەبیت."

کەیفا حەسەنی گەلەك ب ڤان ئاخفتنێن وی هات و سوپاسیا وی کر و گوتێ:

"هێژایی ٘من، ئەز هەموو هێز و شیانێن خوە ژ بۆ خزمەتا وەلاتی دمەزێخم و ئەڤ چەندە جهێ دلخۆشیا منە، هیڤیا من ژ خودایێ مەزن ئەوە ژیێ من ل سەر ڤی کاری درێژ بکەت و هیڤیا من ئەوە ئیمام خومەینی ژی پشتەڤان و هاریکارێ من بیت."

پشتی سەرۆکێ پەرلەمانی ژ وی جهی چووی، حەسەنی هژمارەکا وێنەیان دگەل گرتبوون، هەروەسا هژمارەکا وان ڕۆژنامە و گۆڤاران ژی

کرین یێن وێنەییێن وی دگەل سەرۆکێ پەرلەمانی تێدا ژبەرکو ئەڤە یەکەم جارە ئەو هەست ب بەختەوەریەکا مەزن دکەت، هەروەسا وی دزانی ڕۆژەك دێ هێت ئەڤ وێنەیە دێ مفای گەهینە وی و دێ وی ژ گەلەك بەلاێ و ئاریشەیان قورتال کەن.

پشتی وی دەمی، ئێدی هەر هەلکەفتنەك هاتبایە کرن، حەسەن بەری هەموویان دا پشکداریێ تێدا کەت و ل ڕێزا پێشییێ ڕوونتە خوارێ. ئەڤ چەندە بوو ئەگەر پارێزگەرێ باژێری ژی وی بدانتە سەر کارەکێ باش و ژ هەژی.

لێ ئاریشە ئاها یا ل ڤێرێ، چەوا کەسەکێ گەندەل و فێلباز، خوە هەکە توبە ژی کربیت، دێ خوە ل بەر هێزا پارەی گریت ب تایبەت دەمێ فەرمان و مۆرێن فەرمی یێن حکومەتێ و ترۆمبێلەك بکەڤنە د دەستێ وی دا و ئەو ل سەر هەموو هووردەکارییێن بارودوخێ دارایی یێ باژێری شارەزا بیت.

هەرچەندە حەسەنی بۆ ماوەیەکی شیا ل سەر خوە زالێ ببیت و تەماعیا پارەی سەرێ وی نەخۆت، لێ هەر مرۆڤەك ل دوماهیێ دڤەگەڕیتە سەر بنیاتێ خوە. حەسەنی ژی دووبارە دەست ب وان کارێن چەپەل و گەندەل کر یێن بەری هینگێ وی دکرین، وی چەندین فەرمانێن سەختە دەرێخستن و ب ڕێکەکا نەیاسایی چەندین پارچێێن زەڤیان دانە هندەك کەسان یان ئاسانکاری بۆ هندەکێن دی دکر، هەلبەت بەرامبەر ڤان کاران هەموویان ژی وی پارەیەکێ باش د وەرگرت.

حەسەن ل سەر گەندەلییێن خوە یێ بەردەوام بوو هەتا ڕۆژەکێ کەفتیە د ئاریشەکا مەزن دا و ئاراستەیێ ژیانا وی هەموو گوهاڕتی.

ل ناڤ بازێری پارچەیەکا ئەردی یا باش هەبوو کو وی هزردکر ئەڤ ئەردە ملکێ کەسێ نینە، لەوڕا وی ئەڤ ئەردە فرۆتە کەسەکی داکو بکەتە جهەکێ بازرگانی و وی ژی پارەیەکێ مەزن بەرامبەر ڤی کاری وەرگرت، ئەڤ کارێ وی کری تا دوماهییێ ژی سەرگرت، لێ ژ نیشکەکێ ڤە سکرتێرا پارێزگەری شکایەت ل وی کر، چونکی ئەو ئەرد ملکێ خێزانا وێ بوو.

سکرتێر هاتە دەڤ وی و گوتێ:

"بەڕێز لاجیفاردی، تە پارچەکا ئەردی یا فرۆتی کو نە ملکێ تەیە."

حەسەنی گوت:

"ئەڤ ئەردێ ڤالاً ل هەیڤا بوری من ژ کەسەکی کڕی بوو و نوکە من ئەو یێ فروتیە کەسەکێ دی."

سکرتێرێ لێ ڤەگەڕیا و گوتێ:

"نەخێر، ئەڤ فایلێن تە هەموو د سەختەنە، هەتا ئەو مۆرا تە بکارئینای ژی یا سەختەیە، هەلبەت ئەڤ کارێ تە کری، دێ گران ل سەر تە ڕاوەستیت."

هەر زوو ڤەکۆلین ل سەر ڤی بابەتی هاتنە کرن و حەسەن هاتە دەستەسەرکرن پشتی کو ڕاستیا بابەتێ گەندەلیا وی ئاشکەرا بووی،

حەسەن بۆ ماوەیێ دوو حەفتیان ما د زیندانێ ڤە، پشتی هینگێ داواکارێ گشتی یێ کۆمارا ئیسلامی ل وێ دەڤەرێ  فرێکرە د دووڤ وی ڕا داکو ل نڤیسینەگەها وی بەرهەڤ ببیت.

داواکارێ گشتی گوتێ:

"پشتی مە دووڤچونەکا هوور ل سەر تە کری، بۆ مە دیار بوو د ماوەیێ سالێن بوری دا تە گەلەك جاران پارەیێ دەولەتێ یێ دزی و خیانەت یا ل شۆڕەشێ کری، تە دڤیا ڕابردوویێ خوە یێ پیس بڤەشێری، لێ سوپاس بۆ خودایی ئەندامێن دەستەکا دادوەری شیان هەموو لایەنێن ڤەشارتی یێن ژیانا تە ئاشکەرا بکەن. مللەتێ مە یێ هەژار یێ دنالیت و کوڕێن وی یێ خوینا خوە دڕێژن داکو بەرەڤانیێ ل سەر دەستکەفت و داهاتیێ وی بکەن ژ دەستێ زۆڕدار و گەندەلان، لێ ژ بن ڤە تە بەروڤاژی ڤێ چەندێ ئەنجامددا و هەموو بزاڤێن تە ب تنێ بۆ هندێ بوون کا چەوا ل سەر حسابا برایێن خوە یێن شۆڕەشگێر دێ خوە زەنگین کەی، ژبەر هندێ تو نە ژ هەژی هندێ خوە مرۆڤ فیشەکەکێ ژی ژ بۆ کوشتنا تە بمەزێخیت."

لاجیفادری ژ شەرما دا خوە نەشیا سەرێ خوە ژی بلند بکەت، بەلکو ب دوو چاڤێن شۆڕ ڤە سەرێ خوە چەماند.

دووبارە داواکارێ گشتی گوتێ:

"تە چ ئاخفتن هەیە داکو بەرەڤانیێ پێ ژ خوە بکەی؟ نوکە تو دانپێدانێ ب تاوانێن خوە دکەی؟"

— بەلێ هێژایێ من، من چ نینە بێژم.

داواکارێ گشتی هێشتا بەرپەڕێن فائیلا وی ڤەدان و تاوانێن وی یێن بەرێ دئینانە بیرا وی، پاشی دووبارە هەمان پرسیار ژێ کر کا وی چ ئاخفتن نینە یان بەرەڤانییێ ژ خوە بکەت ل دور وان تاوانێن وی ئەنجامداین.

لێ دیسان حەسەنی گوت:

"نەخێر هێژاییێ من، من چ ئاخفتن نینە، ب تنێ ئەز داخوازا لێبورینێ ژ تە دخوازم ل سەر وان کارێن خراب و تاوانێن من ئەنجامداین."

ناڤچاڤێن داواکارێ گشتی تێکچوون و گوهێن وی یێن مەزن پتر دیار بوون، ئەو گوهێن ب خورتی شیاین دەرسوکا وی ب هەلگرن، هەر چەندە ژیێ وی ب تنێ نێزیکی سیهـ سالان بوو و رهـ و سمبێلێن وی ژی د بوش و بێ سەروبەر بوون.

داواکارێ گشتی گوتێ:

"مەرەما تە ئەوە تە چ تشت نینە پێشکێشی من بکەی؟ ئانکو تە ل بەر نینە چ رێکەفتنان دگەل من ژی بکەی داکو ئەز تە ژ ڤێرێ قورتال بکەم؟"

حەسەنی دزانی گەنگەشەیا وان دێ بەرەڤ ڤی ئاراستەی چیت و وی بەری نوکە پێشبینیا ڤێ چەندێ کربوو، لەورا بەری هینگێ ب دوو حەفتیان وی خوە بۆ بەرسڤدانا ڤێ پرسیارێ ئامادە کربوو.

حەسەنی گوت:

"هێژایێ من، من گەلەك مال و مللك و پارە نینن، لێ ئەز یێ ئامادەمە ئەو پارەیێ من هەی بێخمە د خزمەتا شۆڕەشێ دا و بدانمە بەر دەستێ تە و تو بڕیارێ ل سەر بدەی."

- باشە ئەز دشێم بزانم کوژمەیێ ڤی پارەی چەندە یێ تو دێ ئێخیە بن دەستێ من؟
- هندەك پارچەیێن زێڕی نە کو من ژ مووچەیێ خوە یێ مامۆستایەتیێ کڕینە دەمێ کو ئەز هاتیمە ڤی باژێری، هەرچەندە نە کوژمەکێ مەزنە ژی لێ بۆ من جهێ سەرفەرازیێ یە ئەز پێشکێشی شۆڕەشێ بکەم."

پشتی هینگێ داواکارێ گشتی پێنووسێ خوە ل فائیلا وی دا و بباشی تەماشەی حەسەنی کر و پیچەکێ گرنژی و ل دووڤ دا بۆ ماوەیەکی بێدەنگ ما و گوت:

"باشە ئەڤ پارەیێ تە نوکە ل کیڤەیە؟"

- هندەك نوکە یێ دگەل من و یێ مایی ژی یێ ل بەنکێ.
- کا ئەوێ دگەل تە نیشا من بدە.

حەسەنی ڤائیشا خوە یا پشتێ ژ خوە ڤەکر و دوازدە هزار ڕیال ژێ ئینانە دەرێ و دانانە سەر مێزا داواکارێ گشتی، وی ژی ئەڤ پارە هەژمارتن و گوتێ:

" تو یێ پشتڕاستی کو ب تنێ ئەڤ پارە دگەل تە هەیە؟"

- بەلێ، نوکە ئەو ب تنێ دگەل من هەیە، هەکە تو باوەر نەکەی تو دشێی بهێی من بپشکنی.
- باشە ئەز باوەر ژ تە دکەم، لێ کەنگی پارەیێ مایی دێ بۆ من ئینی؟
- دێ ب نێزیکترین دەم بۆ تە بەرهەڤ کەم.

د ماوەیێ وان چەند هەیڤێن کێم دا، حەسەنی کوژمەکێ مەزن یێ پارەی خرڤە کربوو تا وی ڕادەی ئێدی ڤائیشا وی هند گران ببوو و جهێ پارەیان تێدا نەدکر، ئەو نەچار بوو هندەك ژ پارەیێن خوە ل ناڤ وێ زەڤیێ بڤەشێریت یا بەری هینگێ وی ل دەوروبەرێن باژێری بۆ خوە کڕی.

داواکارێ گشتی گوتێ:

"دڤێت تو گەلەك یێ هشیاربی دەمێ تو دچی کوژمەیێ دی یێ پارەیان دئینی، لێ بێژە من تە چ پیلان هەیە بۆ ئەنجامدانا ڤی کاری؟.

حەسەنی پێشنیاز کر ئەو ب تنێ بچیتە بەنکێ و پارەیێ خوە وەربگریت و پاشی ژڤانەکی ل جهەکێ دەستنیشانکری بدانن داکو کەس وان نەبینیت دەمێ ئەو ل وێرێ پارەیێ مایی بدەتە ڤ وی.

داواکارێ گشتی دیسان پرسیار ژێ کر:

"چیە ما تە جهەکێ دەسنیشانکری هەیە ئەم لێ هەڤدوو بینین؟"

حەسەنی بەحسێ وێ پارچەیا زەڤیێ کر یا وی ل دەرڤەی باژێری هەی و کەس د وێ ڕێکێ ڕا ناهێت و بچیت ب تایبەت دەمێ دنیا دبیتە شەڤ.

هەرچەندە ل دەستپێکێ ئەو یێ دوودل بوو، لێ پشتی هینگێ ڕازی بوو بچیتە وی جهی و وی گەف ل حەسەنی کرن و گوتێ:

"بزاڤێ نەکەی من بخاپینی یان هزرێن ڕەڤینێ بکەی، چونکی هەر دەمێ تو ژ ڤێرێ دەردکەڤی ئەز دێ زێرەڤانیا تە کەم."

دەمێ دەستپێکێ حەسەن هاتیە باژێرێ کرمان، وی باوەری ب تنێ ب بەنکەکێ هەبوو پارەیێن خوە بکەتە تێدا، پاشی ئەو دگەل داواکارێ گشتی ڕێکەفت بەری نیڤرو بچیتە بەنکێ و پارەیێ خوە وەربگریت، ل دانێ ئێڤاری ل ناڤ وێ زەڤیێ دێ ل هیڤیا وی بیت یا بەری نوکە بەحسێ وێ بۆ کری.

بۆ کەسەکێ فێلبازێ وەکی حەسەنی گەلەك یا ب سانەهی بوو د ماوەیەکێ کێم دا خوە بگەهینتە بەنکێ و ژێ دەرکەڤیت و پارەیێ خوە دگەل خوە ببەت، دەمێ وی هەستپێکری کەسەك یێ دووڤچوونا وی دکەت، هەر زوو خوە دناڤ قەرەبالغا خەلکی دا ڤەشارت و شوونوارێن خوە ل پێش چاڤێن وی کەسی بەرزەکرن، ل دووڤ دا ئەو چوو ناڤ زەڤیا خوە و چاڤەڕێی هاتنا شەڤێ بوو.

دەمژمێر نەهی شەڤێ بوو دەمێ ترۆمبێلەك نێزیکی زەڤیا وی بووی و دەرگەهێ وێ ڤەبوو و داواکارێ گشتی ژێ هاتە دەرێ، ئەو زەڤی هەمیوو ب سیمەیەکێ بچووك یێ چوارچۆڤەکری بوو و کەپرەکا بچووك

دناڤدا هاتبوو ئاڤاكرن و هندەك كەلوپەلێن چاندنێ و جهێ ڕوونشتنێ دبنڤە بوون.

هەروەكی حەسەنی پێشبینی كری، داواكارێ گشتی ب تنێ هاتبوو وێرێ چونكی وی دڤیا ئەڤ پارەیێ ژ حەسەنی وەردگریت بۆ وی ب تنێ بیت.

ل دووڤ دا  داواكارێ گشتی گوت:

" ئەڤە جهەكێ ئارام و جوانە، هەروەكی تە بەری نوكە بەحسێ وی بۆ من كری، ئەڤە ژ كەنگی وەرە تە كڕیە؟"

حەسەنی گوت:

"ئەڤە نە دەمەكێ ژ مێژەیە، گەلەك جاران ئەز و هەڤالێن خوە دهاتینە ڤێرێ دەمێ سەقایێ گەرم بایە یان ژی دەمێ من هەست ب واستیانێ كربایە، هەرچەندە من ترۆمبێل نینە لێ ئەز ب پیاسە دهاتمە ڤێرێ."

داواكارێ گشتی دڤیا هەر زوو ڤی بابەتی ب دوماهی بینیت، لەوڕا گوتە حەسەنی كا ئەو پارەیێ مایی بینە داكو هەر یەك ژ مە بچیتە سەر ڕێكا خوە.

حەسەنی گوت:

"چ پێنەڤێت هێژایێ من، من پارە یێ ل وێراهە ڤەشارتین، ب دووڤ من بكەڤە داكو بچین بینینە دەرێ."

داواکارێ گشتی ب دووڤ وی کەفت، ئێدی ڕوودان گەلەك ب لەز بڕێڤە دچوون. دەمێ داواکار چوویە دبن کەپری ڤە و خوە خوار کری، هەر یەکسەر حەسەنی تەڤرەك ل سەرێ وی دا و ئێخستە ئەردی و کوشت. حەسەنی هەر زوو چاڵەکا مەزن یا ئاخێ کۆلا و کەلەخێ داواکاری هاڤێتە تێدا و ئاخ هاڤێتە سەر.

بەری حەسەن کەلەخێ وی بهاڤێژتە د چاڵێ دا، جلێن وی یێن کارێ دادوەرییێ ب هشیاری ژبەرکرن داکو چ خوین نەمینتە پێڤە پاشی وی ئەڤ جلکە کرنە بەر خوە.

پشتی هینگێ حەسەنی دەرگەهێ بیستانی گرت و سواری ترۆمبێلا داواکارێ گشتی بوو و بۆ نێزیکی نیڤ میلی بەرەڤ باکووری بۆ لایێ باژێرێ "ڕافار" هاژووت بێی کو لایتێن وێ هەلکەتێ، پاشی ئەو گەهشتە سەر پرەکێ و ل وێرێ هاتە خوارێ بێی کو ترۆمبێلێ بڤەمریت یان ب ڕاوەستینیت، لەوڕا ترۆمبێل د پرێ دا کەفت و ب کووراتیا سیهـ مەتران بن ئاڤ بوو.

دەمێ بوویە سپێدە و ئەو ژ خەو هشیاربووی، دیت ئەو یێ ل دەڤەرەکا چیایی یا ئاسێ و کەس ل واران نینە لەوڕا جلێن خوە شووشتن و ڕائێخستن هەتا هشك بووین چونکی دەمێ وی دادوەر کوشتی هندەك خوین مابوو ب جلێن وی ڤە، ل دووڤ دا وی چاڵەکا دی کۆلا و جلێن دادوەری و کەلوپەلێن دگەل وی کرنە تێدا و ئەو کاغەز و فائیلێن بەری هینگێ د ترۆمبێلا وی دا ئینابوونە دەرێ و هەموو سووتن داکو چ شوونوارێن وی نەمینن.

نوکە دەمێ هندێ هات ئەو پرسیارێ ژ خوە بکەت بەرەڤ کیڤە بڕەڤیت، چونکی هەلبەت نوکە ل زیندانێ زەنگ هاتیە لێدان کو حەسەن یێ دیار نینە و د هەمان دەم دا داواکارێ گشتی ژی یێ بەرزەبووی.

دەمەکێ درێژ پێڤە نەچوو دەمێ ڤەکۆلینێ دەستپێکری و ترۆمبێلا داواکارێ گشتی هاتیە دیتن، لەوڕا هەر زوو پۆلیس هاتن و ڤەکۆلین دگەل خەلکێ باژێرێ "ڕافار" و گوندێ "دەربەند" و دەڤەرا "نەهیدان" ئەوا دکەڤیتە سەر دەوروبەرێن بیابانێ کر.

ل ڤێرێ هاتە بیرا حەسەنی کو جارەکێ ئەو دگەل وێ خێزانا ل باژێرێ کرمان ئەوا وی ژورەکا خانیێ وان ب کرێ گرتی، ڕۆژەکێ هاتبوونە ڤی ڕێکێ بۆ سەیرانێ و بیرا وی دهێت کو ل لایێ دی یێ چیایی ڕێکەکا گەلەك نەخۆش و ئالۆز هەبوو و دەمێ ئەو پیچەکێ وی ڤەتر چووین چەندین ژێهەلییێن تەنگ و ئاسێ کەفتنە بەر سینگێ وان، پشتی هینگێ ڕەوشا سەقایی تێك چووبوو لەوڕا ئەو نەشیابوون بەردەوامیێ بدەنە گەشتا خوە و بچنە گوندێ کوبایێ.

نوکە حەسەن نێزیکی بیست میلان یێ ژ گوندێ کوبایێ دوورە، لێ وی چ ڕێکێن دی نەبوون لەوڕا نەچار بوو وێ ڕێکا نەخۆش ببڕیت هەتا دگەهیتە گوندی.

پشتی بورینا نیڤ دەمژمێرێ ل سەر چوونا وی بەرەڤ وێ ڕێکا نەخۆش، ئەڤ جارە بەخت هەڤالێ وی بوو، ژ دوورڤە دەنگێ پاسەکا کەڤن هات کو دا بەرەڤ گوندی چیت، شۆفێری سەرێ خوە ژ جامێ ئینا دەرێ و گوتێ:

"وەرە دگەل مە سوار ببە ئەی مەلایێ بەڕێز، ئەز دێ تە گەهینمە جهێ تە بڤێت."

هەرچەندە حەسەنی ل بەر نەبوو دگەل وان سوار ببیت، لێ هەکە وی ئەڤ چەندە نەکربایە دا بیتە جهێ گۆمانێ بۆ وان کەسێن د پاسێ دا، ل دووڤ دا وی پرسیار ژ شۆفێری کر:

" بلا ئەز دێ دگەل تە سواربم، لێ کریا سواربوونێ چەندە؟"

شۆفێری پێ کرە کەنی و گوت:

"ئەز کرێیا سواربوونێ ژ وەلیێن خودایی وەرناگرم، تو مێهڤانێ مەی."

پشتی هینگێ حەسەن سواری پاسێ بوو و چوو دوماهیێ ڕوونشت، د وێ پاسێ دا هەشت کەسێن دی ژی د سواربوون و هەر یەکێ چانتەك و هندەك کەلوپەل دگەل بوون، لێ ژبەرکو ئەو هەموو د خەو بوون لەوڕا وان ئاگەهـ ژ سواربوونا حەسەنی نەبوو.

پشتی نیف دەمژمێرا دی، پاس گەهشتە گوندێ کوبایێ، هەلبەت ئەڤرۆکە ڕۆژا بازاڕکرنێ یە ل گوندی.

دەنگوباسێ هاتنا زەلامەکێ ئایینی، مەلا حەسەنی، بۆ گوندێ کوپایێ هند زوو ل گوندێ هەموویێ بەلاڤبوو هەروەکی کا چەوا ئاگر بەردبیتە پیشی. هەرچەندە بەری هینگێ هندەك جاران زەلامێن ئایینی و مەلا دهاتنە گوندێ کوبایێ لێ ب تنێ د ڕۆژێن هەلکەفتنان دا بوو، لێ ئەڤ مەلایە ب چ شوول هاتیە گوندی؟ و ئەرێ پا کانێ یە موختارێ گوندی؟

بۆچی ل دەمێ هاتنا مەلایی موختار یێ ئامادە نەبوو کو پێشوازییا وی بکەت هەروەکی وی پێشوازییا مەلایێن دی دکر دەمێ دهاتنە گوندی.

هەر زوو کورێ بیرکۆلێ گوندی، ئەو زەلامێ ب کارێ کۆلێنا بیران ڕادبیت، ب لەز چوو ل موختاری گەڕیا و دەمێ گەهشتیە بەر دەرگەهێ کۆچکا وی گازی کر"حەجی ئیبراهیم! حەجی ئیبراهیم!."

لێ موختار ل جهێ خوە نەبوو، بەلکو یەك ژ هاریکارێن وی ب ناڤێ شوکرللاھـ جەلیلی ل جهێ وی بوو.

زارۆکی گوت:

"ئەرێ موختار ل ڤێرێ یە؟"

شوکرللاھـ جەلیلی بەرسڤا وی دا:

"نەخێر ئەو ل ڤێرێ نینە، هەرە ناڤ مێرگا بنێ گوندی یێ چوویە وێرێ."

پشتی زارۆك گەهشتیە وێرێ، دیت موختار یێ دناڤ گیایێ مێرگێ دا ڕوونشتیە و کیسکێ وی یێ تووتنێ یێ د دەستان دا و یێ جگارەکێ بۆ خوە دروست دکەت و پەزێ وی ژی ل ناڤ وێ مێرگێ یێ دچەریت.

بێهنا زارۆکی چك بوو و هەما ئاخفتن ژبەر دەردکەفت

— حەجی ئیبراهیم وەرە، نوکە وەرە ب لەز.

موختاری سەرێ خوە بلندکر و ب مەندەهۆشی ڤە گوتە زارۆکی:

"ته خێره ئەی زارۆکێ جوان بۆچی بێهنا ته هۆسا تەنگ بوویه؟ بێژه من چ چێبوویه؟"

دووباره زارۆکی گوت:

– وەره نوکه، هەموو یێن ل هیڤیا ته.

پاشی دەستێ موختاری گرت و دڤیا هاریکارییا وی بکەت دا ڕابیته ژ پێرڤه.

– مەلا، مەلا، مەلایەك دگەل نەسرۆللاهی د پاسێ دا یێ هاتیه گوندی.

موختار ب دووڤ زارۆکی کەفت و بەرەڤ گوندی چوون، هەرچەنده وی هند باوەر ژ ئاخفتنێن زارۆکی نەدکر لێ وی دڤیا بچیته ناڤ گوندی دا بزانیت کا بابەت چیه، دەمێ ئەو گەهشتیه گوڕەپانا نیڤەکا گوندی وی دیت بازاڕ گەلەك یێ گەرم بووی، لێ چ شوونوارێن مەلایان د دیار نینن.

پاشی چاڤێ وی ب شۆفێری پاسێ کەفت، پرسیار ژێ کر:

" کا بێژه من نەسرۆللاهـ چ چێبوویه؟ ئەرێ ڕاسته ته مەلایەك دگەل خوه ئینایه گوندی؟"

نەسرۆللاهی بەرسڤ دا:

"بەلێ جەنابێ موختاری من مەلایەك یێ دگەل خوه ئینای، وی گەلەك دگەل من نەدئاخفت، من ژی پارەیێ سواربوونێ ژێ نەوەرگرت، چونکی ئەز دزانم خودا ل جهەکێ دی دێ بۆ من بەدەل ڤەکەت، بەری

نوکە ئەو ل ڤێرێ بوو لێ ئەو چوو ناڤ گوندی بزانیت کا موختار ل کیڤەیە."

پاشی موختاری ئەو بجهـ هێلا و بەرەڤ کۆچکا خوە چوو، دەمێ ب ژوور کەفتی وی دیت حەسەن لاجیفاردی یێ ل سەر خوارنێ ڕوونشتیە و دگەل شوکرللاهی خوارنێ دخوت.

موختاری گوت: "السلام علیکم."

حەسەنی بەرسڤا وی دا و گوتێ:

"و علیك السلام، خودا تە و گوندێ تە بپارێزیت ئەی موختارێ هێژا."

موختار بەرەڤ وی چوو و پیچەکێ خوە بۆ خوار کر وەك ڕێزگرتن و سوپاسیەك بۆ هاتنا وی، پاشی گوتێ:

"تو گەلەك بخێرهاتی بۆ گوندێ مە ئەی مەلایێ قەدرگران، ئەم هەموو د خزمەتا تە داینە."

پاشی شوکرللاهـ ی قوریکێ چایێ و هندەك پرتێن کێکێ ئینان، حەسەنی ب دەنگەکێ نەخۆش فرەك ل چایا خوە دا و ب لەز پرتێن کێکێ داعیران ژبەرکو ئەڤە ژ دوهی وەرە وی چ تشت نەخوارین و ئەو ڕوودانێن د ماوەیێ بیست و چوار دەمژمێرێن بوری دا ڕوودابن برسا وی پتر لێکربوو. پشتی وی تێر خوارێ و ڤەخوارێ، ب پشتا دەستێ خوە دەڤێ خوە پاقژ کر و گوت:

"ناڤێ من حەسەن لاجیفاردی یە، ئەز بەردەوام ژ گوندەکی دچمە گوندەکی دی ب ناڤێ ئیمامێ شۆڕەشێ دئاخڤم داکو پەیڤێن خودایی و پاشی پەیڤێن ئیمامی بۆ خەلکی ڤەگێڕم."

موختاری تەماشەی سەروبەرێ حەسەنی کر کو ڕاستە سیمایێ وی یێ کەسێن ئایینی یە، ڕهێن وی یێن درێژ و سپی، دەرسوکا وی یا ڕەش ئەوا دانایە سەر سەرێ خوە وەکی یا وان کەسانە یێن ل دووڤ ڕێبازا پێغەمبەری دچن، هەروەسا عەبایێ وی یێ قەهوایی یێ تەنك و درێژ هەتا کو دکەڤیتە سەر سەندەلا وی. پاشی هەموویان پێکڤە گوت:

" مەزناهی بۆ خودایی و پێغەمبەرێ وی بیت و ژ خودایێ دخوازین ژیێ ئیمامێ مە درێژ بکەت."

پاشی حەسەنی سحبەت گوهۆڕی و گوت:

"ئەز یێ ژ باژێرێ کرمان هاتیم، بەری وی ئەز ل باژێرێ یەزد بووم و بەری هینگێ ل ئەسفەهان و بەری ئەسفەهانێ ژی ئەز ل باژێرێ قوم یێ پیرۆز بووم."

موختاری گوتێ:

"مەلایێ هێژا، ب ئانەهیا خودایی ئەڤە دێ جهێ تەبیت، هەرچەندە ئەم خەلکەکێ هەژارین لێ ئەم ب زەحمەتا دەستێ خوە پاریەکێ حەلال بۆ زارۆکێن خوە پەیدا دکەین، هەر تشتێ تۆ ژ مە بخوازی ژی یەکسەر دێ بۆ تە بجهئینین، خودایێ مەزن تو یێ بۆ مە فرێکری داکو ببیە یەك ژ مە."

- ئەز مەلایەکێ ب تنێ مە و من چ تشت ژ هەوە نەڤێن، تشتێ من دڤێت ئەوە کو ئەز هەست ب گەرماتیا باشیا خەلکێ هەوە یێ هەژار بکەم و هەست ب ڕەوشا وان بکەم."

ل وی دەمی هەموو ژ ڤەخوارنا چاییێ ژی ب دوماهی هاتبوون و پشتی بێدەنگیەکا کورت، لاجیفاردی گوتە موختاری:

"بەری ئەز بگەهمە گوندێ هەوە، خەلکێ گوندێ بەری هەوە گەلەك پەسنا تە دکر لەوڕا من بڕیاردا ئەز سەرەدانا تە بکەم و بۆ ماوەیەکێ کورت ببمە مێهڤانێ تە بەری بچمە باژێرەکێ دی، لەوڕا ئەز داخوازا لێبورینێ ژ تە دخوازم کو ئەز نەشێم بو ماوەیەکێ درێژ بمینمە دناڤ هەوە دا."

کەیفا موختاری گەلەك ب ڤان ئاخفتنان هات و زانی کو ئەڤ سەرەدانا مەلای بۆ گوندی وەکی ڕێزگرتنێ یە بۆ وی، ژبەر هندێ وی خۆشترین ژوورا کۆچکا خوە بۆ وی تەرخان کر و دەمێ بوویە شەڤ ژی خەلکێ گوندی هەموو خڕڤەکرن و مەلا بۆ وان دا نیاسین و هاتنا وی ببوو جهێ دلخۆشیا خەلکێ گوندی.

پشتی هینگێ موختار و مەلا حەسەن پتریا وەختان پێکڤە بوون، موختاری هەموو جهێن گوندی نیشا وی ددان، وی ژی بەحسێ سەرهاتیێن خوە بۆ موختاری دکرن و ئەو تشتێن سەیر یێن وی د ژیانا خوە دا دیتین، هەروەسا بەحسێ چوونا خوە بۆ حەجێ ل باژێرێ مەککەهێ و دیدارا خوە یا کەسایەتی دگەل ئیمام خومەینی ل پایتەخی بۆ دکر.

دەمێ ڕۆژەکێ ل دانێ ئێڤاری عەلی ڤەگەڕیایە گوندی، چاڤێ وی ب حەسەنی کەفت. وان هەردووکان تەماشەی هەڤدوو کر و پیچەکێ بێدەنگ مان، ل دووڤ دا وان سلاڤ کرە هەڤدوو و هندەك پەیڤێن سادە و بێ بها گوتنە یەك و تڕانە کرن. کەسێ تیبینیا هندێ نەکر کو ئەڤ هەردوو کەسە بەری نوکە هەڤدوو دنیاسن.

پشتی هینگێ ب دەمەکێ کێم، موختارێ گوندی نەچار بوو ل سەر داخوازیا عەلی، خانیێ ئاغایێ گوندی بۆ حەسەنی ڤالاً بکەت و دوو ژنێن گوندی ژی بڕاسپێریت خزمەتا وی بکەن، هەلبەت ئەڤ حەسەنێ بەری نوکە ژ زیندانێ ڕەڤی نوکە ناسناڤێ مەلا حەسەن یێ دانایە سەر خوە و یێ بوویە گرنگترین کەس د گوندێ کوبایێ دا.

پشتی بورینا چەند هەیڤان، کاریگەڕیا ڤی مەلایێ سەختە ل سەر موختارێ گوندی زێدەبوو، ئێدی موختارێ گوندی نەك تنێ ل بەر خزمەتا وی یێ ڕاوەستیایی بوو کا چ دڤێت بەلکو هەر یەکسەر بۆ بجهـ دئینا ژی.

مەلای هزرێن خوە کرن کا چەوا ئەڤ جارە دێ مفایی ژ ڤێ دەلیڤەیێ بینیت، ئەو دێ هۆسا سەرەدەریێ کەت و کارێن خوە هەموویان ب موختاری دەتە دیارکرن داکو کەس گۆمانێ ژێ نەبەت.

دگەل کارێ مەلاتیێ، وی دەست ب شۆڕەشەکا بچووك ژی کر ژبەرکو کارێ وی دەلیڤە دایێ ئەو وەك دادنڤیس کاربکەت دەمێ داخواز ژێ دهێتە کرن. هەروەسا وەك پارێزەر و ناڤەندگێڕ و شیرەتکار، هەتا هند

بوویە جهێ باوەریێ ل دەڤ گوندیان هەر کەسێ نهێنیەك هەبایە دا بەری هەموویان هێت بۆ وی بێژیت.

ئەو خانیێ ئاغایێ بەرێ یێ گوندی نوکە وەکی دادگەهەکێ لێ هاتیە، چونکی مەلا حەسەن تێڤە هەموو ڕۆلان دگێڕیت، جار دادوەرە، جار پارێزەرە، جار داواکارێ گشتی یە، هەلبەت وی بەرامبەر ڤی کارێ خوە ژی پارەیەکێ باش وەردگرت. هەر زوو ئەو بوو خۆدانێ هندەك زەڤییێن ئەردی و شەش بزن و هندەك مریشك و خانیەکێ هەڕفتی کڕین. یا ژ هەموویێ گرنگتر، نوکە ئەو یێ بوویە خۆدانێ بیستانەکێ مەزن کو دکەڤیتە سەر وی ڕووباری یێ ئاڤا وی دبەر گوندی ڕا دبوریت و نهاڵەك دکەڤیتە بنێ بیستانێ وی.

حەسەنی ئەڤ مال و ملکە هەموو ب ڕێکەکا یاسایی ب دەستخوە ڤە ئینان ئەو ژی ب ڕازیبوونا موختارێ گوندی و هاریکارێ وی. هەرچەندە خانم زەهرایێ بەردەوام هۆشداری ددانە موختارێ گوندی کو هشیاری ڤی کەسی بیت، ژبەرکو ئەڤ کەسێ ب ترس نە ب تنێ ئەهریمەنە بەلکو کەسەکێ سەختەچیە ژی، لێ ئیبراهیمی قەت گوهداریا ئاخفتنێن وێ نەدکر و دگوتێ تو مایێ خوە د مەلای نەکە.

زەهرایێ د دلێ خوە دا دگوت "هەی ژارۆ موختار، خۆزی ب تنێ تە زانیبا کا ئەڤ سەختەچیە د پشت تە ڕا چ دکەت."

ئیبراهیم د ژیانا خوە هەموویێ دا ژ گوندێ کوبایێ نەدەرکەفتبوو ب تنێ جارەکێ نەبیت، ژبەرکو ئەو گەلەك یێ هەژار بوو لەوڕا وی شیانێن چوونا حەجێ یان باژێرێ کەربەلا ل عیراقێ نەبوون، وی

هەموو ڕیالێن خوە خرڤەدکرن هەتا جارەکێ شیایی بچیتە باژێرێ "مەشهەد" کو جهێ ژدایکبوونا وی بوو کو ئاهەنگا ژدایکبوونا خوە یا سیە سالیێ ل وێرێ کر.

د ڤێ گەڕیانا وی دا یا بۆ ماوەیێ هەیڤەکێ ڤەکێشایی ل باژێری، کاریگەریەکا مەزن ل سەر ژیانا وی کر. دەمێ ئەو دووبارە زڤڕیە گوندی ژ کەسەکێ بێتاقەت و لاواز بۆ کەسەکێ ئارام و بیرتیژ، بەری هینگێ وی گرنگی ب چ تشتان نەددا، لێ نوکە و پشتی زڤڕی بڕیاردا ڕۆژانە بۆ ماوەیێ دەمژمێرەکێ بچیتە قۆتابخانەیا گوندی داکو هەر چ نەبیت فێری خواندن و نڤیسین و بیرکاریێ ببیت.

پشتی ئەو زڤڕیە گوندی، خەلکێ ئێدی دگوتێ حەجی ئیبراهیم، ڤێ چەندێ بهایێ وی دناڤ خەلکێ گوندی و بەرپرسێن ناڤخۆیی و موختارێن گوندێن دەوروبەر دا بلند کر.

ب ساخلەتا موختارێ گوندێ کوبایێ کو هژمارا خەلکێ وێ نێزیکی دوو سەد و پێنجی کەسان بوون، باوەریەکا مەزن ب خوە هەبوو و ب درێژاهیا ژیێ خوە ئەوی هاریکاریا خەلکێ گوندی دکر و هەموو وەکی هەڤالێن خوە دهەژمارتن و چ جاران دیاری بەرامبەر کارێ خوە ژ خەلکی وەرنەدگرتن.

وی چ جاران خوە دیکلەك یان کیلۆیەکا برنجی ژی ژ گوندیەکی وەرنەگرتیە خوە هەکە چەند کارەکێ مەزن ژی بۆ ئەنجامدابایە یان هاریکارییا وی کربایە، ژبەر ڤێ چەندێ زەهرا مەندەهۆش ما کا بۆچی

ئەڤە هەیامەکە ئیبراهیم ژی حەز ژ مالێ دنیایێ و بەرتیلان دکەت ب تایبەت پشتی حەسەن هاتیە دناڤ گوندی دا.

هندەك جاران ئیبراهیم و مەلا حەسەن بۆ ماوەیێ چەندین دەمژمێرێن ل دووڤ یەك د ژورەکا خانییێ ئاغاییێ گوندی ڤە دمانە ب تنێ و کەسێ نەدزانی کا ئەو گەنگەشەیێ ل سەر چ بابەت دکەن، هندەك جاران هاشم ئەوێ هەڤژینا وی وەغەرکری و عەلی ئەوێ ل بازێرێ کرمان ڕۆژ بۆ ڕۆژێ پارەیێ وێ زێدەتر لێ دهاتی، دچوونە دەڤ وان.

دەنگێن کەنی و سحبەتێن وان دگەهشتنە گوهێن زەهرایێ کو مالا وێ ب ڕەخ مالا ئاغاییێ بەرێ یێ گوندی ڤە بوو، هەر چەندە وێ ب دروستاهی نەدزانی کا ئەو بەحسێ چ دکەن لێ ئەو یا پشتڕاست بوو کو ئەڤ هەر چوار کەسە یێ پیلانێ بۆ کارەکێ ب مەترسی ددانن ئەو ژی ب هاریکارییا ئیبراهیمێ بەلنگاز ئەوێ ئاگەهـ ژ چ نە  و مەلایێ بوویە جهێ باوەریا خەلکی، دناڤ ڤێ قەرەبالغێ دا، دەنگێ عەلی و مەلای ژ یێ هەموویان بلندتر و دیارتر بوو.

تشتێ ژ هەموویان پتر بوویە جهێ گۆمانێ ل دەڤ زەهرایێ، حەجی ئیبراهیم بوو، ئەوێ نەدزانی کا دێ چ مفا ژ ئەنجامدانا ڤێ پیلانێ گەهیتە وی ژبەرکو ئەوی منەت ب چ تشتان نینە، وی خانییێ خوە یێ هەی و زارۆکێن وی یێن مەزن بووین و بووینە خۆدان خێزان، هەروەسا داهاتێ وی یێ سادە ژی تێرا پێدڤییێن وی یێن ڕۆژانە دکەت، پشتی هەڤژینا وی وەغەرکری ژی وی قەت هزرا ئینانا ژنەکا دی نەکریە و هەموو گاڤان جلێن سادە دکەتە بەر خوە.

ل وی دەمی هندەك گوتگوتك دناڤ گوندی دا بەلاڤبوون کو عەلی ل بەرە هەڤژینەکا دی ل باژێری بۆ خوە بینیت کو کەسێ بەری نوکە ئەو ژن نەدیتیە، هەرچەندە وی ب یەکجاری پەیوەندیێن خوە دگەل سوڕەیایێ یێن بڕین لێ هێشتا وی ئەو نەبەردایە.

ئەو نەدشیا سوڕەیایێ بەردەت ژبەرکو بەردانا وێ دێ وی نەچار کەت پارەیەکێ مەزن بدەتە وێ چونکی سوڕەیایێ چ کێماسی نینن و وی داخوازا بەردانێ یا کری.

ل وێ ڕۆژێ، ژبەر ترسا وێ ل سەر پاشەڕۆژا کچا خووشکا خوە یا بێگونەهـ، زەهرایا پیر نەچار بوو دەستان ژ بنەما و بیروباوەرێن خوە بەردەت. ل وێ ڕۆژێ ب دەنگەکێ بلند ل نیڤا گوڕەپانا گوندی کرە هەوار و گازی کرە ئیبراهیمی داکو هەموویان گوهـ لێ ببیت:

"هێ تو ئیبراهیم، دەمێ تو ژ کارێ خوە ب دوماهی دهێی وەرە دەڤ من ل مال، بزاڤێ بکە زوو بهێی، ئەز دێ چاڤەڕێی تە بم."

بەری نوکە کەسێ گوهـ ل هندێ نەبوویە کو جارەکێ خانم زەهرا کەسەکی مێهڤان کەتە مالا خوە، لێ دیارە ڤێ جارێ ڤێ کارەکێ فەر یێ هەی و وێ باوەریەکا تەمام ب خوە هەیە و ژ کەسێ ناترسیت.

ئیبراهیمی دەست ژ کارێ خوە بەردان و سەرێ خوە بلند کر تەماشەی زەهرایێ کر، زەهرا ژ وی دوورکەفت و دووبارە ل سەر ملێ خوە زڤڕی و گوتێ: "ژبیرنەکە ئەز دێ ل هیڤیا تەبم."

دەمێ دنیا بوویە ئێڤارەکا درەنگ، ئیبراهیمی دەرگەهێ مالا زەهرایێ قوتا.

زەهرایێ گازی کرێ:

"وەرە ژوور ڤە دەرگەهـ یێ ڤەکریە، تو گەلەك گیرۆ بووی، چونکی ئەڤە ژ گاڤا دی وەرە ئەز ل هیڤیا تە."

ئیبراهیمی ب هندەك پەیڤێن كێم ئەزمانێ خوە لڤلڤاند و پاشی ڕوونشتە خوارێ.

زەهرایێ پرسیار ژێ کر:

"ئەرێ بەری حەسەن لاجیفاردی بهێتە گوندی تە داخوازا هاتنا وی کربوو یان تە فرێکربوو د دووڤ وی ڕا؟ ئەرێ ما تو نە بەرپرسیارێ گوندێ خوەی؟ یان تە ئەڤ چەندە ژبیرکریە؟"

- چیە تو سیخۆڕیێ ل سەر من دکەی؟
- ما دێ بۆچی ئەز سیخۆڕیێ ل سەر تە کەم؟ تشتێ یەکانە یێ ئەز دکەم ئەوە دەمێ دهێمە د پەنجەرێ دا و تەماشەی تە دکەم کا تو چ دکەی و ل کیڤەی، ل دەمێ بوری تە پتریا دەمێ خوە ل مال و کۆچکێ یان دناڤ بیستانی دا دبوراند، لێ نوکە ب شەڤ و ڕۆژ تو یێ ل مالا ڤی کەسێ ژ نوو هاتیە گوندی.
- زەهرا، تو هێشتا ئەو پیرەژنی یا نەشێیە ئەزمانێ خوە. ئەرێ ما تو چ جاران ناهێیە گوهۆڕین؟
- ئەرێ تو هزردکەی دوو کەسێن پیر وەکی من و تە د ڤی ژیێ مەزن دا ژ نوو تبعەتێ خوە ب گوهۆڕن، دەمێ ڤێ

چەندێ یێ چووی، ئاها ئەڤ تشتەیە من تۆڕە دکەت ئەی حەجیێ دانعەمر.

— ئەو چ تشتە تە تۆڕە دکەت.

— ئەز ئێدی وی تشتی ل دەڤ تە نابینم یێ خەلکێ گوندی سەرا هندێ ڕێز ل تە دگرتی. پشتی حەسەن هاتیە گوندی تو گەلەك یێ کەفتیە بن کاریگەڕیا وی. ژ خوە ئەز بەحسێ هاشم و عەلی هەر ناکەم چونکی ئەو ژ هەژی ڕەزیلکرنەکا مەزنن، لێ ئەز قەت د تە ناگەهەم د ڤی ژیێ مەزن دا، نزا ژ نوو چ ل تە هاتیە!.

— ئەز هێشتا وەکی بەرێ مە زەهراخان و تو ڤێ چەندێ باش دزانی.

— هەڤالێ من یێ بەلنگاز، تە ئاگەهـ ژ خوە نینە و تو هەست ب خوە ناکەی، هەموو کەس باش دزانن تو گەلەکێ هاتیە گوهۆڕین و نەمایە ئیبراهیمێ بەرێ، ئەز نزانم کا کارێ تە دگەل ڤی زەلامی چیە یان دێ چ مفا گەهیتە تە، لێ من دڤێت تشتەکی بۆ تە بێژم و باش گوهێ خوە بدێ، ئەز ب چ ڕەنگان ناهێلم تو زیانێ بگەهینیە خوارزایا من، تو نە ب تنێ حەجی ئیبراهیم یان موختارێ گوندی بی بەلکو خوە هەکە تو کی بی، چونکی ئەز دزانم هوون یێ پیلانەکێ بۆ ژناڤبرنا وێ ددانن و خەلکێ گوندی هەموو ژی نهێنیا هەوە دزانیت."

— خەلکێ گوندی کیژ نهێنیێ دزانیت؟

— خەلك دزانن هوون یێ پیلانەکێ دژی سورەیایێ د بەرژەوەندیا عەلی دا ددانن.

ئیبراهیمی ب دەنگەکێ نزم ڤە بەرسڤا وێ دا:

"ڕاستە عەلی دڤێت کچکەکا جوان ل باژێری بۆ خوە بخوازیت و ئێدی مالا خوە ببەتە وێرێ چونکی هەڤژینا وی چاڤێ خوە نادەتە وی. هەروەسا باش بزانە کو ئێدی عەلی گەلەك گازندەیان ژ وێ دکەت چونکی سورەیایێ ب یەکجاری ئەو یێ ب پشتگوهڤە هاڤێتی و چاڤێ خوە نادەتە زارۆکێن خوە ژی. ئەو خوارنا ئەو بەرهەڤ دکەت کەس نەشێت بخۆت، هەروەسا ئەڤە پشتی هەڤالا وێ فەیروزە چوویە بەر دلۆڤانیا خودایی، ئەو دەمەکێ درێژ ل مالا هاشمی دمینیت."

زەهرایێ ئاخفتنا وی بڕی:

"ئیبراهیم لاهوتی، کا باش بەرێ خوە بدە چاڤێن من، تە ئاگەه ژ دەڤێ خوە هەیە تو چ دبێژی؟ ئەرێ ما تو شەرم ژ خوە ناکەی؟ تو ل ڤی گوندی هەموویێ بگەڕی تو چ هەڤژین و دایکێن نموونە ژ سورەیایێ باشتر نابینی و تو ڤی تشتی ژ من باشتر دزانی."

— لێ ئەم هەموو یێ وێ ب چاڤێن خوە دبینین. ئەو ڕۆژانە دچیتە مالا هاشمی و گەلەك دمینتە ل وێرێ.

زەهرایێ پشتا وێ گرت و گوت:

"لێ مە هەموویان هیڤی ژێ کرن ئەو بچیتە وێرێ چونکی کەسێ نەدڤیا ڤی کاری بکەت، یان بیرا تە ناهێت؟ ئیبراهیم، هزرێن خوە باش

بکە و خوە ب سەرڤە نەبە، دەمێ جارا یەکێ ژی هەر تۆ ب خوە دگەل وێ چوویە مالا هاشمی!."

ڤی زەلامێ دانعەمر سەرێ خوە هەژاند لێ چ تشت نەگوتن.

پاشی زەهرایێ پرسیار ژێ کر:

"من دڤێت ئەز بزانم کا ب دروستاهی چ چێدبیت."

ئیبراهیمی بەرسڤ دا و گوت:

"ئەڤ چەندە شوولێ زەلامانە نەك یێ ژنان، ژبلی ڤێ چەندێ ژی تو هەر تێناگەهی خوە هەکە ئەز چەند جاران بۆ تە بێژم ژی."

- مەرەما تە تو ب تنێ تێدگەهی؟ یان دەبەنگێن دی حەسەن و عەلی و هاشم، ئاخ چ کۆمەکا زیرەك و تێگەهشتیە! تو ئەڤ پیرەمێرێ دانعەمر، یان ئەڤێ دی یێ ناسناڤێ خوە کریە مەلا، یان بێ خێرێ دی ئەڤێ هەتا نیف شەڤ ل مالا لەشفرۆشێن باژێری.
- ئەز دەلیڤەیێ نادەمە تە تو بەحسێ بەڕێز حەسەن لاجیفاردی ب ڤی شێوازێ کرێت و نەجوان بکەی، ئەو زەلامەکی ئایینی یە و دڤێت تو ڕێزێ لێ بگری و وی چ گونەهـ نەکرینە، تە ئەو ماف نینە ئێدی بەحسێ کەسێ ب خراپی بکەی.

زەهرا ژێ تۆڕە بوو و گوت:

"تو ب خوە دزانی کو تو یێ درەوان دکەی یا ئیبراهیم، لێ وی تو یێ کریە گوستیرك و کریە تبلا خوە و ل دووڤ حەزا دلێ خوە تە باددەت، تو نەمایە ئیبراهیمێ بەرێ، ئەرێ ما تو شەرم ژ خو ناکەی نێ ئەز پتر یا ژ پێش تە ڤە شەرم دکەم."

هۆسا ب ڤی ڕەنگی زەهرا ل سەر ئاخفتنێن خوە یا بەردەوام بوو هەتا کو چ ئاخفتنێن کرێت نەماین وێ نەگوتینە ئیبراهیمی.

ل دووڤ دا گوت:

" د ڤان چەند هەیڤێن بوری دا تە هەموو تشت یێن ژدەستداین، هەموو ئەو تشتێن ماف ددایە تە ببیە موختارێ گوندی وەك باوەری و دەستپاکی و وێرەکی و سەربخۆیی و چاکسازی.... نوکە سەحکە خوە. نوکە تە هند وێرەکی نینە تو تەماشەی خوە د خۆدیکێ دا بکەی، ئەڤە ژ مێژە تو نەمایە موختارێ گوندی یێ ب دروستاهی. ئەز ب تنێ ڤێ چەندێ نابێژم، بەلکو خەلکێ گوندی هەموو یێ هەڤڕایە دگەل من و ئەڤ چەندە بۆ مە هەموویان مە تشتەکێ سەیرە.

ئەز هۆشداریێ ددەمە تە ئەی حەجیێ دانعەمر چونکی ئەز کەسا یەکانەمە ل گوندی دوێرم ب ڤی شێوازی دگەل تە باخڤم. ئەگەر تو دەستان ژ ڤی کاری نەبەردەی ئەز دێ وەکی بەری بمە سترێەك د ڕێکا تە دا... ها بیرا تە دهێت؟ کا بیرا خوە بینە بەرێ؟"

هەرچەندە سوڕەیایێ ئاگەهـ ژ وێ پیلانێ نەبوو یا د خانیێ ئاغایێ بەرێ ڤە دژی وێ دهاتیە گێڕان، لێ د ڕاستی دا وێ گرنگی ژێ نەددا ڤێ چەندێ چونکی ئەو یا ژ خوە پشتڕاست بوو کو ئەو کەسەکا

بێگونەهە و عەلی و هاشم ژی باش ڤێ چەندێ دزانن، لێ دگەل ڤێ چەندێ ژی زەهرایێ بەردەوام هۆشداری ددانە وێ.

زەهرایێ گوتێ:

"کچا من، دڤێت تە گەلەك ئاگەهـ ژ خوە هەبیت چونکی عەلی و هاشم گەلەك هاتینە گوهۆڕین و وەکی بەرێ نەماینە، هاشم پشتی هەڤژینا وی وەغەرکری، وەکی کووچکەکێ سەی یێ گوهدار ل دووڤ هەڤژینێ تە دچیت، ئەو نوکە ب تنێ ل دووڤ بەرژوەندیا خوە دچیت و فەیروزە ژی بۆ وی یا ساخ نینە ڕێکێ لێ بگریت، هەڤژینێ تە ئەڤە چوویە باژێری هەموو دابونەریتێن وان یێن پیس ئینباینە دناڤ گوندی دا."

سوڕەیایێ چ بەرسڤ نەبوون، وێ دزانی خالەتا وێ ڕاست دبێژیت لێ ما ئەوا بەلنگاز دێ شێت چ کەت؟ ئەڤە ماوەیەکێ درێژە عەلی دگەل وێ نائاخڤیت، هەردوو کوڕێن وێ یێن مەزن ژی یێن ب دووڤ بابێ خوە ڤە، زارۆکێن وێ یێن بچووك ژی هەموو گاڤا یێن ژ دەرڤە و هەتا دنیا نەبیتە شەڤ نزانن قەستا مال بکەن، دەمێ دهێنە مال ژی جلێن وان یێن پیس بووین و تۆز یا مایە پێڤە.

دەمێ سوڕەیایێ زانی کو دوژمنیا بەرامبەر وێ یا زێدەتر لێ دهێت، ئێدی بارێ وێ ژی گەلەك گران بوو. ڕۆژەکێ بڕیاردا هەما ئێدی ب یەکجاری نەئاخڤیت، دەمێ زەهرایێ زانی کو خوارزایا وێ ئەڤ بڕیارە یا دای، بۆ وێ دیار بوو کو ئێدی سوڕەیا نەشێت بەرەڤانیێ ژ خوە بکەت.

ژ لایەکێ دی ڤە، چ تشت ژ حەسەن لاجیفاردی یێ کێم نەبوو، ئەو کەسێن هاتینە ڕاسپاردن چاڤدێریا وی بکەن، هەموو سپێدەهیان

لێترەکا شیری و ماست و نانێ گەرم و چا بۆ دئینان، هەر داخوازیەکا وی هەبایە هەر زوو بۆ دهاتە بجهئینان.

ژبەر وان گرێبەستێن نهێنی یێن جودا جودا، هەر زوو شیا پارەیەکێ مەزن کۆم بکەت و ببیتە خۆدانێ هژمارەکا مەزن یا زەڤی و بیستانێن گوندی و یەك ژ کەسێن هەرە زەنگین ل وێ دەڤەرا چیایی هەموویێ. لەزاتیا گەشەکرنا سامانێ وی زێدەبوو پشتی کو هندەك گرێبەست دگەل خەلکێ دەڤەرا گەلیێ دکەڤیتە بنارێ چیایی گرێداین ئەو ژی ب هاریکارییا عەلی کو وەك ناڤەندگێڕ بۆ وی کاردکر.

سەرەڕای ڤێ چەندێ هەموویێ، ئەو شیا هەموو نهێنییێن خوە یێن بەرێ بپارێزیت، هەروەسا وی ناڤێ خوە ل سەر چ گرێبەستان نەدڤیسا بەلکو ل شوونا وی پیتێن دەستپێکی یێن ناڤێ خوە دنڤیسان و وی ل شوونا وی موختاری ئەو ڕێکەفتن و گرێبەست ئیمزا دکرن.

پشتی هینگێ عەلی ژی بۆ خۆدانێ یەك ژ باخچەیێن پڕی داروبار ل دەوروبەری گوندی و دناڤ کوژیەکێ وێ دا کەپرەك ژ بۆ بێهنڤەدانێ هاتبوو دانان. حەجی ئیبراهیم ژی ژ ڤان دەستکەفتیان یێ بێ بەهر نەبوو و چەندین پشك دگەهشتنە وی ژی، هەروەسا عەلی ڕۆژەکێ ئەو دگەل خوە برە دەڤ ژنێن لەشفرۆش ل بازێری لێ هۆسا دیار بوو کو وی چ خۆشی ژ وی جهی نەدیت.

ئەڤ گرێبەستە هەموو ب نهێنی ڤە دهاتنە گرێدان، لێ حەسەنی ل پشت پەردەیێ کونترۆل ل سەر هەموو تشتان دکر.

حەسەنی پتر ژ هەمووو کەسان، کونترۆل ل سەر ئیبراهیمی دکر چونکی ئیبراهیم موختارێ گوندی بوو خەلکی و باوەریەکا مەزن پێ هەبوو، هەروەسا مۆرێن فەرمی یێن حکومەتێ د دەستێ وی دابوون، لێ حەسەن و عەلی شیان ڤێ مۆرێ بۆ چەندین کارێن بازرگانی یێن سەختە بکاربینن.

هەردەمێ مەلای ڤیابایە، ئیبراهیم دا مورا فەرمی بۆ وی ئینیت بێی کو کەسەك بزانیت یان گۆمانێ ژێ ببەت، ئەڤ چەندە ژی ژبەر دوو ئەگەران بوو، یا یەکێ چونکی پتریا خەلکێ گوندی خواندن و نڤیسین نەدزانی، یا دووێ: ئەو کەسێن کێم یێن خواندن دزانی ژی ب شێوازێ بەلگەنامەیێن فەرمی دهاتنە خاپاندن.

موختارێ گوندی هەر تشتەکێ هاتبایە بەر دەستێ وی، وی ئیمزا دکر و پاشی مورا خوە لێددا ب ساخلەتا هندێ کو ئەو مەزنێ گوندی یە، هەروەسا ل دووڤ پیلانا مەلا حەسەنی بۆ دانایی، ئێدی پووتە ب ئاخفتنێن زەهرایێ ژی نەدکر چونکی ئاخفتنێن وێ دێ بنە ئەگەر پتر خەلك باوەریا خوە ب موختاری بینن ئەگەر ئەو بەرسڤا وێ نەدەت.

ئێدی کەسێ گرنگی نەددا وان گرێبەستان، دەمێ هەردوو کوڕێن مەزن یێن عەلی پرسیار ژ بابێ خوە کری کا ئەڤە چیە ڕوویددەت، هەر یەکسەر مەلا و موختار و عەلی و هاشمی هندەك بەرسڤێن بەری هینگێ ئامادەکری ددانە وان.

پشتی بۆ وان دیار بووی کو هاشم ژی ب دروستاهی یێ بوویە هەڤپشکێ وان و ئەو دشێن ئێدی پشت بەستنێ بکەنە سەر، وان داخواز

ژێ کر هندەك بێ بەختیان د دەرحەقا سوڕەیایێ دا بێژیت وەك پێشنیارکرنا کرنا زنایێ و ئازراندنا هەستێن وی یێن سێکسی ب ڕێکا ڤەکرنا سینگێ خوە یان گوتنا هندەك پەیڤێن هۆسا کو ژن ڤان پەیڤان ژبلی هەڤژینێ خوە نابێژنە چ کەسێن دی.

لێ تشتێ ژ هەموویان ئیبراهیم یێ لێ هشیار و ژێ د ترسا زەهرا بوو، چونکی وی نەدڤیا د چاڤێن وێ دا وەکی کەسەکێ خراب بهێتە دیارکرن، وێ بەردەوام د پەنجەرکا مالا خوە دا زێرەڤانی ل وی دکر ژبەرکو وێ دزانی کا چ تشت یێ دهێتە ڕوودان.

ئەو ماوەیێ پتر ژ پێنجی سالان بوو، زەهرا شیایی کونترۆلێ ل سەر ئیبراهیمی بکەت و بۆچوونا خوە ل سەر وی ب سەپینیت و هەر تشتێ ژێ داخواز بکەت بۆ بجهبینیت، ئەو چ جاران نەدوێریا داخوازیەکا وێ یا بچووك ژی بپشتگوهڤە بهاڤێژیت، لێ نوکە دەم یێ هاتی ئەو دژی وێ ڕاوەستیت ژبەرکو چ نەمایە  ددەستێ وێ دا.

پیلان یا بەردەوام بوو، زەهرایێ بەردەوام بزاڤ دکرن ئەو دژی ڤان هەردوو زەلامان ڕاوەستیت، دڤێت وێ گەلەك ئاگەه ژ خوە هەبیت داکو نەکەڤیتە دەستێ ڤی کەسێ ژ نیشکەکێ ڤە هاتیە گوندی، ئەرێ تو بێژی هندەکان ئەو فرێکر بیت؟ یان ئەرێ ڕاستە وی پەیوەندی دگەل بەرپرس و کەسێن مەزن هەنە؟ یان ژی ئەو دشێت پۆلیس و زێرەڤان و دەستهەلاتداران د بەرژەوەندیا خوە دا بکاربینیت هەروەکی وی بەری نوکە ئەڤ کارە گەلەك جاران کری.

ئیبراهیم د درێژاهیا ژیێ خوە دا، خۆدان کەسایەتیەکا لاواز بوو، بڕیارێن ئاغایێ گوندی یێ بەرێ ئەو نەچار کربوو خوە بۆ بچەمینیت و بێدەنگ کەت، هەروەسا ئەو ل هەمبەر ئاخفتن و ڕەفتارێن هەڤژینا خوە ژی یێ بێدەنگ بوو لەوا ژ بازێری هاتیە گوندێ کوپایێ، هەروەسا ئەو نەدشیا کوڕێن خوە ژی ئەوێن ئاخفتنێن کرێت دگوتنە کچێن گوندی و نەخوشی دگەهاندنە وان.

لێ ژبەرکو زەهرایێ هەموو گاڤان ئەو ڕەزیل دکر و ل پێش چاڤێن خەلکی دشکاند، ل دوماهیێ وی بڕیاردا ئەو مەعدەنێ خوە یێ ب دروستاهی نیشا وێ بدەت.

نوکە چ تشت ل بەر سینگێ وی نەماینە، دەمێ حەسەن و عەلی ب بەلگە و ب هاریکارییا هاشمی ئەو بێ بەختیێن ب دووڤ سوڕەیایێ ڤە هاتینە نان دیار دکەن و خەلك هەموو ل سەر کارێ وێ یێ خڕاب ئاگەهدار دبیت، ئەو دێ باوەر ژ ئاخفتنێن ڤان دیدەڤانان کەت و سنوورەکی بۆ سوڕەیایێ و ئاخفتنێن خالەتا وێ دانیت.

# بەشێ چوارێ

زەهرا کو دانعەمرترین ژن بوو ل گوندێ کوبایێ، ژنەکا ب ناڤسال ڤە چوویی یا لاواز بوو و پشتا وێ خوار ببوو، هەرچەندە کەسێ ژیێ وێ یێ ب دروستاهی نەدزانی، لێ ئەو ژی وەکی ئیبراهیمی گەلەك پیر بوو و ژیێ وان ژ حەفتێ سالان بوری بوو، خەلکێ گوندی هەموو تا ڕادەیەکی ژێ دترسیان لێ هەموویان ڕێزەکا مەزن لێ دگرت و دلێ وێ نەدهێلا.

بۆ ماوەیێ چەندین سالان، خەلکێ گوندی چ بڕیار بیێ ڕازیبوونا وێ نەددان و هەموو گاڤان بۆچوونا وێ ل سەر هەموویان یا زالێ بوو، هەتا بابەتێن بڕینا دارێن دارستانێ و دروستکرنا پرەکێ ل سەر ڕووبارێ گوندی و کۆلانا بیران و خواستنا هەڤژینان و بەهیان هەموو ب بڕیارا وێ دهاتنە ئەنجامدان.

گوندی دەمێ بۆ دانا بڕیارەکێ دوودل بانە دا هێنە دەڤ وێ و داخوازێ ژێ کەن هاریکارییا وان بکەت ژبەرکو ل وی دەمی خەلکێ گوندی هەموویان دزانی کو حەجی ئیبراهیم ئەوێ پشتی مرنا بابێ خوە یێ پیر جهێ وی گرتی و بوویە موختارێ گوندی، نە کەسەکێ شارەزا و زیرەکە، لێ زەهرا بەروڤاژی کەسەکا بیرتیژ و تێگەهشتی بوو لەوڕا شیا هەبوونا خوە ب سەپینیت و ببیتە موختارا گوندی و کەس نەوێریا خوە ژ ڤێ چەندێ نەڕازی بکەت.

وێ دەمێ خوە دناڤبەرا کارێ مال و کارێ موختاریێ دا دابەش کربوو، وێ کێم دئاخفت لێ گەلەك گوهداری دکر، لێ وێ زوو ب زوو پێشوازییا خەلکی ل مالا خوە نەدکر ب تنێ هژمارەکا کێم نەبیت.

هەر ژ بچووکاتی، زەهرا فێرببوو حەفتیێ ب کێمی سێ جاران بچیتە سەر ڕووبارێ دبەر گوندێ وان ڕا دبوری ژ بۆ شووشتنا جلوبەرگێن خێزانا خوە ڤێجا خوە هەکە کاودانێن سەقایی د خۆش بان یان د نەباش ژی بان.

زەهرا د کاروبارێن گشتی و تایبەت یێن هەموو خەلکێ گوندی بوو دا بستە ببوو، وێ سەرپەرشتیا ژدایکبوونا زارۆکان و سنەتکرنا وان دکر، ئەو کچ و کوڕێن ژیانا هەڤژینیێ ژی پێکدئیناى، ل شەڤا دەهواتێ دا دگەل وان ئاخڤیت و شیرەتان لێ کەت کا چەوا دێ سەرەدەریێ دگەل هەڤژینێن خوە کەن. ژیێ زەهرایێ گەهشتبوو هندێ وێ هەموو هەڤالێن خوە یێن بچووکاتی ب دستێ خوە ڤەشارتبوون، ئانکو چ هەڤالێن وێ یێن بچووکاتیێ د ژیانێ دا نەمابوون.

ژ لایەکێ دی ڤە ئەوێ چ جاران حەز ل سەر هندێ نەبوو بچیتە باژێران ب تایبەت باژێرێ کرمان و ل وێرێ بژیت، لێ وێ بەردەوام گوهـ ل وان چیرۆك و چیڤانۆکان دبوو یێن خەلکی ل دور باژێری بۆ هەڤدوو دڤەگوهاستین ب تایبەت ئەوێن جار جار دچوونە باژێری.

دەمێ ئەو ڕۆژا پاسە ژ باژێری دهاتیە گوندی و دبوو ڕۆژا بازارکرنێ، زەهرایێ خوە بەرزە دکر و حەز ژ خەبسێ نەدکر، هەروەسا دەمێ ل هەموو ڕۆژێن پێنج شەمبیان ئاغایێ گوندی و خێزانا وی دهاتنە

گوندی، هاتنا وان بۆ زەهرایێ نە هندا گرنگ بوو و زوو ب زوو نەدچوو دیوانا وان.

ئەو فێر ببوو ل هەلکەفتا ڕۆژا سێزدەی بەدرێ کو دبوو ڕۆژا سێزدەیێ پشتی جەژنا نەوروزێ و خەلك هەموو ژ گوندی ددەرکەفتن، لێ ئەو ب تنێ دا مینتە دناڤ گوندی دا پیاسا دناڤ کولانێن گوندی دا کەت و دا چیتە دناڤ مالێن گوندیان دا، د ڤی دەمی دا ژبلی دەنگێ سەیێن گوندی و چەکچەکیلەیێن سەر داران و دیمەنێ پەلاتینکێن ل دەستپێکا بوهارێ، چ تشتێ دی ل گوندی نەدهاتە گوهلێبوون یان دیتن.

پشتی بورینا چەندین سالان، ئێدی وەکی بەرێ وێ پشکدارییێ د کاروبارێن خەلکی و هەلکەفتنێن وان دا نەدکر، هەتا ڕۆژا شەهیانا کەسەکی ژی بایە ئەو نەدهاتە دناڤ دا، بەلکو ب تنێ ل بەهیان دهاتە دیتن ب تایبەت دەمێ مری بەرەڤ گۆڕستانێ دبری و دڤەشارتی چونکی ئەو ژی دا دگەل چیت و خاترا خوە بۆ جارا دوماهیی ژێ خوازیت.

بابێ زەهرایێ یەکەم کەس بوو ل گوندێ کوبایێ بیرێن ئاڤێ کۆلاین، دەمێ وی یەکەم بیر ل گوندی کۆلای دەلیڤە دا زەهرایێ ئەو یەکەم کەس بیت ئاڤێ ژ بیرێ بکێشیت، ژبەر هندێ ئێدی خەلکی ئەو بیرە ب ناڤێ وێ ناڤکر.

گوندێ کوپایێ و دەوروبەرێن وێ، جیهانا یەکانە بوو یا زەهرایێ دیتی چونکی ب درێژاهیا ژیانا خوە ئەو زوو ب زوو ژ مالێ نەدەردکەفت یا بابێ وێ بۆ وێ هێلای کو دکەفتە ب ڕەخ خانییێ ئاغایێ گوندی ڤە. هێشتا

ئەو یا بچووك، کچەکا ئازاد و سەربخوە بوو د هزرکرنێ دا و پشت بەستن دکرە سەر خوە ب تنێ.

ل وی سەردەمی، کچ نەدچوونە بەر قوتابخانەیێ و خوە فێری خواندن و نڤیسینێ نەدکر بەلکو دناڤ مال دا هاریکارییا دایکێن خوە دکرن د رێڤەبرن و ئەنجامدانا کارێن رۆژانە یێن مالێ و دەمێ هێشتا ژیێ وان یێ بچووك دا وان دەنە شوی، پتریا جاران دا وان هەر دەنە کورەکێ هەڤسوویێ وان ب خوە.

دەمێ زەهرا هێشتا یا بچووك، رۆژەکێ پاسە ژ باژێرێ کرمان هات و ئەڤ جارە مامۆستایەکێ گەرۆك دگەل خوە سوار کربوو کو چەندین پێنڤیسێن رەنگاورەنگ و دەفتەر دگەل بوون و چەندین رۆژان ما ل گوندی دا زارۆکێن وان فێری خواندن و نڤیسینی بکەت، زەهرا یەك ژ وان قوتابیان بوو یێن رۆژانە دچوویە نك ڤی مامۆستایی و زیرەکترین قوتابیا وی بوو ژ بۆ ژبەرکرنا وانەیێن خوە.

پشتی هینگێ ئەو یا بەردەوام بوو ل سەر خواندنێ و سال بۆ سالێ زیرەکتر لێ دهات و دوماهیێ گەهشتە وی رادەی کو ئەو تشتێ چەندین سالان وێ خواندی نیشا خەلکی ژی بدەت، وێ بەردەوام دگوت:

"خودا و پێغەمبەرێ وی گەلەك گرنگی دایە خواندن و نڤیسینێ، ژبەر هندێ پێدڤیە ل سەر هەموو موسلمانان خوە فێری خواندنێ بکەن و زارۆکێن خوە ژی فرێکەنە قوتابخانەیان."

رۆژەکێ، دایك و بابێن وێ بریاردا وێ بدەنە شوو و ئەو کەسێ دا دەنێ ژی ناڤێ وی "مورتەزایێ رەمەزانی" بوو، لێ ئەو ژ مال رەڤی و چوو

دناڤ ڕەزێن گوندی دا و هەتا دنیا بوویە شەڤ ژ نوو زڤڕی مال، ئەو نەیا ڕازیبوو ب ڤێ هەڤژینیێ چونکی وێ بڕیار دابوو ب چ ڕەنگان شوو ب زەلامەکی نەکەت کو خواندن و نڤیسینێ نەزانیت.

ل دوماهیێ ئەو ڕازیبوو شوو ب گەنجەکی بکەت ب ناڤێ "نیعمەتوللاھ" کو نێزیکی دەھ سالان ژ وێ مەزنتر بوو، هەرچەندە ئەو ژی ل دەستپێکێ نەیێ خواندەڤان بوو لێ وی ل سەر خاترا زەهرایێ خوە فێری خواندنێ کر. ل دووڤ دا ژبلی هەڤژینەکا دلسوز، ئەو بوو دەستێ ڕاستێ یێ موختارا گوندی و ل پێش وێ ڤە کاروبارێن نڤیسێن و بەرپرسیارییێن هەلگرتنا تۆمارێن گوندی ب ستۆیێ خوە ڤە گرتبوون.

ژبەرکو هێشتا ئەو ژی د ژیەکێ نە هندێ مەزن دا بوو دەمێ شوو کری، لەوڕا بەختێ وێ ژی وەکی بەختێ هەموو کچێن دی یێن گوندی بوو. د ماوەیێ دەھ سالێن دەستپێکێ یێن هەڤژینیێ دا، زەهرا چەندین جاران ب دووگیان کەفت و شەش زارۆك ئینانە سەر دنیایێ، لێ ب تنێ کوڕەکێ وێ بڕیاردا ژ ژیانا گوندان دوور بکەڤیت و بچیت ل باژێری بژیت، ل باژێرێ کرمان وی وەك پۆلیس کاردکر.

ژیانا هەڤژینیێ یا زەهرایێ دگەل نیعمەتوللاهی بۆ ماوەیێ سیھ سالان ڤەکێشا، پشتی هینگێ ب دەمەکێ کێم بەری هەڤژینا حەجی ئیبراهیمی بمریت، هەڤژینێ وێ ژی وەغەرکر، لەوڕا پتریا خەلکێ گوندی هزر دکر ئەڤ هەردوو پێکڤە دێ دووبارە ژیانا هەڤژینیێ پێکئینن چونکی ژ مێژە وەرە ئەو هەڤالێن یەکن لێ چ تشتێ ژ ڤی ڕەنگی ڕوونەدا.

ژبلی گرنگیدان ب خێزانا خوە و چوونا سەر ڕووباری ب ئاوایەکێ بەردەوام، ئێدی زەهرایێ گرنگی ب چ تشتان نەددا، پشتی وێ کچێن خوە ژی هەموو داینە شوو کو مالێن هەڤژینێن وان ل گوندێن دی بوون، ئێدی زەهرا ما ب تنێ و زوو ب زوو هەڤژینێن کچێن وان نەدهێلا سەرەدانا دایکا خوە بکەن چونکی زێدە مایێ خوە د ژیانا وان دکر و ئەڤ چەندە ب دلێ وان نەبوو، لێ بەروڤاژی زەهرایێ هزردکر ئەو یا کارەکێ باش دکەت.

هەر هێشتا زوو، زەهرایێ گەلەك چاڤێ خوە ددا کچا خووشکا خوە سوڕەیایێ و ئەو کەسا یەکانە بوو یا ماف هەی بێ رۆخسەت بهێتە د مالا خالەتا خوە ڤە، عەلی گەلەك ب ڤێ چەندێ یێ نەخۆش بوو چونکی وی دزانی نوکە سوڕەیا گەلەك گازندەیان بۆ خالەتا خوە دکەت دەربارەی درەو و فێلبازیێن هەڤژینێ خوە. دەمێ زەهرایێ ئەڤ چەندە ژ عەلی زانی، عەلی ئێدی گەلەك ژ وێ ترسیا.

سوڕەیا ژی وەکی خالەتا خوە یا ب بەخت بوو و شیا فێری خواندن و نڤیسینی بیت لەوڕا وێ زارۆکێن خوە ژی هەموو فێری ڤێ چەندێ کربوون، خالەتا وێ کابانیەکا مالێ یا سەرکەفتی بوو لەوڕا وێ بزاڤ دکر وەکی خالەتا خوە ژنەکا مالێ یا سەرکەفتی بیت و زارۆکێن خوە ب جوانترین شێوە پەروەردە بکەت.

سوڕەیایێ ئەو شیرەتا خالەتا خوە ل بەر چاڤ وەرگرتبوو کو هند دناڤ کولانێن گوندی دا نەدهات و چوو و زوو ب زوو دگەل کەسێ نەدئاخفت ب تنێ ل وی دەمی نەبیت وەختێ یەکی پرسیارەك ژێ کربایە.

دەمێ وێ دیتی عەلی دڤێت ئێدی بچیت ل باژێری بژیت، وێ بەردەوام دگەل خوارزایا خوە دئاخفت و شیرەت لێدکرن.

ڕۆژەکێ سپێدێ دەمێ زەهرا د ژوورا لێنانگەهێ ڤە، ژ نیشکەکێ ڤە دەنگەکێ بلند ژ دەرڤە هاتە گوهێن وێ، هەرچەندە ئەو ڕۆژ ڕۆژا بازارکرنێ بوو، دەنگێ دوکاندار و وان کەسێن تشتێن خوە دفرۆتین یێ بلند بوو، لێ هندەك ڤێژی ژناڤ ڤی دەنگێ قەرەبالغێ هاتنە گوهێن وێ، ئەڤ چەندە بوو ئەگەر ئەو زوو بەرەڤ پەنجەرکێ ڤە بچیت داکو بزانیت کا چ ڕوودایە، وی دیت کۆمەکا خەلکی ب چەند مێترەکان ژ مالا وێ د دوورن، وێ بزاڤ دکر خوە بلند بکەت داکو بزانیت ئەڤ دەنگێ ڤێژیا ژ کێ دهێت.

وی خەلکی دکرە هەوار و دگوت:

"لەشفرۆش.. لەشفرۆش، تو ژنەکا لەشفرۆش و خرابی، تو ژنەکا نەباشی."

ل دوماهیێ زەهرایێ دەنگێ عەلی ژی گوهلێبوو و ژ ڤێ چەندێ مەندەهۆش بوو. وێ پیچەکێ خوە گرت و پاشی بڕیاردا بچیتە ژ درەڤە و خوە نێزیکی وی خەلکی بکەت کا بابەت چیە، ل دووڤ دا هندەك دەنگێن دی بلند بوون و دگوت:

"ئەی ژنا تامسار و بێ قیمەت، نەفرەتێن خودایی ل سەر تەبن هەی بێ شەرما بێ شەرم."

ل دووڤ دا زەهرا شیا دنیڤەکا وی خەلکی ڕا ببوریت و بچیتە پێشیێ، وێ هند دیت کو سوڕەیا یا ل بەر سینگێ وان و خەلك یێ قەسە و ئاخفتنێن کرێت دبێژنێ و تف دکەنێ، هندی سوڕەیایێ بزاڤ دکر خوە ژ

دەستێ وان بینتە دەرێ لێ هندەك زەلامان بەردەوام شەق لێددان و پێهن ددانانێ.

کەسەکی ژ وێ کۆما مرۆڤان گوتێ:

"خانم زەهرا تو خوە بدە لایەکی، ئەڤ ژنا خڕاب نەهەژی هندێ یە تو بەڕەڤانیێ ژێ بکەی، تو بهێلە ئەم دزانین دێ چەوا سەرەدەریێ دگەل وێ کەین."

زەهرایێ سوڕەیا ڕاکرەڤە و هەموو کەس بێدەنگ بوون، پاشی وێ ب ناڤچاڤ گرێ ڤە گوتە عەلی:

" ئەڤە چیە ل ڤێرێ چێدبیت؟ چیە تو دین بووی؟ تو دزانی کا تو چ دکەی؟"

عەلی بەرسڤا وێ دا:

"ئەو تشتێ تو دبینی ب تنێ ئەوە کو ئەو دێ سزایێ خوە وەرگریت، ئەوێ خیانەت ل من کر و دڤێت بهێتە سزادان، تە نوکە زانی؟"

- "مەرەما تە چیە کو وێ خیانەت ل تە کریە؟ کەنگی و ل کیڤە و دگەل کێ؟"
- "نوکە، ل ڤێرێ، دگەل هاشمی، من ئەو هەردوو بێ جلوبەرگ دگەل یەك دیتن."

دیسان خەلکی کرە هەوار:

"عەلی ڕاست دبێژیت، وێ خیانەت یا لێ کری و دڤێت سزایێ ڤی کاری وەربگریت."

لێ هێشتا زەهرا نەشیا وی تشتێ ب چاڤ دیتی باوەر بکەت. پاشی گوت:

"بەس بکەنە هەوار، ئەز نزانم کا هوون چ دبێژن پێکڤە وەرن دا بچینە مالا من و ب دروستاهی ل سەر ڤی بابەتی باخڤین."

زەهرایێ سوڕەیا دا بەر سینگێ خوە و برە د مالا خوە ڤە، عەلی و نێزیکی بیست کەسێن دی یێن گوندی ل دووڤ وان چوون. دەمێ ئەو گەهشتینە بەر دەرگەهی، زەهرایێ گوت:

"ژبلی سوڕەیا و عەلی، کەس ژ هەوە نەهێتە د ژوور ڤە، هەر نوکە یەك ژ هەوە بچیتە ددووڤ موختاری ڕا و بینتە مالا من."

لێ ئەو خەلك هەموو ما ل بەر دەرگەهی هەتا حەجی ئیبراهیم هاتیە وێرێ، دیت سوڕەیا یا دکەتە گری و ب ڕەخ وێ ڤە عەلی یێ ڕاوەستیایە و گەلەك یێ تۆڕەیە. دەمێ موختار گەهشتی، پرسیار ژ زەهرایێ کر:

"ئەڤە چ قەڕەبالغە ل ڤێرێ؟ چ چێبوویە؟"

بەری زەهرا بەرسڤا وی بدەت، عەلی کرە هەوار و ب دەنگەکێ بلند گوت:

"وێ خیانەتا ل من کری، وێ کارێ خراب دگەل هاشمی یێ کری، من بەری نوکە دزانی ئەو ڤێ چەندێ دکەت لێ ئەڤرۆکە من ئەو بێ جلك ل دەڤ یەك دیتن."

حەجی ئیبراهیمی سەحکرە سوڕەیایێ و گوتێ:

"ئەڤ ئاخفتنا هەڤژینێ تە دبێژیت ڕاستە، تە خیانەت لێکریە؟"

سورەیایێ بێهنا خوە کوور هەلکێشا و گوت:

"نەخێر، ئاخفتنا وی ڕاست نینە، من چ جاران خیانەت لێنەکریە."

عەلی زێدەتر تۆڕە بوو و گوت:

"تو درەوان دکەی، تو ژنەکا درەوینی، خەلك هەموو باش تە دنیاسن، ئەو دزانن کو تو ڕۆژانە دچوویە مالا هاشمی و تە پتر گرنگی ب وی و خێزانا وی ددا ژ خێزانا خوە. تو هەڕۆژ ل دەڤ وی دنڤستی و ئەم هەموو ڤێ چەندێ دزانین."

- ئەڤا تو دبێژی هۆسا نینە، تو بۆچی بێ بەختیان ب دووڤ من ڤە دنی؟ خالەتا من تو ڕاستیێ باش دزانی نەهێلە ئەو ڤان ئاخفتنان بێژیت.

سورەیایێ دەستێ خالەتا خوە ب هێز گرت و داخواز ژێ کر ئەو وێ ژ عەلی بپارێزیت. زەهرایێ دلەك ل بەر دلێ خوارزایا خوە دا و پاشی سەحکرە عەلی و گوتێ:

"باشە مانە تو دبێژی وێ خیانەت یا ل من کری، کا بێژە ب دروستاهی وێ چ کریە؟"

عەلی بەرسڤ دا:

"ئەو دزانیت وێ یا چ کری، من دیت ئەو چوونە بن گوهێن هەڤدوو و ب نهێنی ڤە دئاخفتن، من ئەو ب چاڤێن خوە دیت، ئەو یا گونەهكارە."

ئیبراهیمی ئاخفتنا وی برِی و پرسیار ژ سورەیایێ كر:

"ئەرێ هەڤژینێ تە راست دبێژیت؟"

نیشانێن نەرازیبوونێ ل سەر دێمێ سورەیایێ دیار بوون و پاشی رۆندك ژ چاڤێن وێ هاتنە خوارێ و نەشیا كونترۆلێ ل سەر گریا خوە بكەت، پاشی گوت:

"من گوتە هاشمی من خوارن یا ئامادەكری و جلك هەموو یێن شووشتین لێ ئەز دێ وان دگەل خوە بەمە مال داكو ئوتی بكەم و پاشی ئەم گرِنژین و ئەز دەركەفتم، هوون هەموو دزانن ئەز نوكە چاڤدێریا مالا هاشمی دكەم پشتی فەیروزێ وەغەركری."

- ئەرێ هەڤژینا من یا خۆشتڤی، چ پێنەڤێت هەموو كەس ژی دزانن تو بۆ ماوەیەكێ درێژ دمینیە د مالا وی ڤە و ب رەخ وی ڤە خوە درێژ دكەی، هەتا هندەك دبێژن تو یا ژ وی ب دووگیان كەفتی.
- ئەڤە درەوە، هاشم ب چ رەنگان نێزیكی من نەبوویە، هوون چەوا دشێن بێ بەختیەكا هۆسا مەزن ب دووڤ من ڤەنن، ئەز ژنەكا خێزاندارم و من هەڤژینێ خوە یێ هەی و چ جاران كارێن هۆسا ناكەم.

هێدی هێدی پیچەکا گۆمانێ بۆ ئیبراهیمی پەیدابوو و ب دەنگەکێ نەرم گوتێ:

"سوڕەیا خان، ئەم هەموو ژ بچووکاتی وەرە تە دنیاسین و تو کەسەکا هێژایی، لێ ڕاستە دەمێ تو دچیە د مالا هاشمی ڤە تو بو ماوەیەکێ درێژ دمینیە ل وێرێ، ژبەر هندێ من دزانی کا بۆچی هەڤژینێ تە گازندەیان دکەت و دبێژیت تە مال و خێزانا خوە یا بپشتگوهـڤە هاڤێتی."

سوڕەیایێ گوت:

"من خێزانا خوە بپشتگوهـڤە نەهاڤێتیە، پرسیارا زەهرایێ و هەڤسوویێن من بکە، ئەو دێ بێژنە تە کا ئەز چەند دایکەکا باش و هەڤژینەکا دلسوزم."

عەلی دیسان دەست ب ئاخفتنێ کر و گوت:

"ئەڤە درەوە، گوندی هەموو دزانن تە خیانەت یا ل من کری، دەمێ ئەز د چوویمە بازێرێ کرمانێ تە خیانەت ل من دکر، مەلا حەسەنی ئەڤ چەندە دزانی، کا بلا موختار پرسیارا وی ژی بکەت."

زەهرایێ ئاخفتنا وی بڕی و گوت:

"چ گونەهـ د هندێ دا نینە ئەگەر سوڕەیا دگەل هەڤژینێ نێزیکترین هەڤالێ خوە باخڤیت، هاشم زەلامەکێ باش و شۆلکەرە، فرێکەنە ددووڤ وی ڕا و بلا ئەو ڕاستیێ بێژیت."

پشتی هینگێ هاشم ژی هاتە دەڤ وان و یەکسەر ئیبراهیمی پرسیار ژێ کر:

"کا بێژە من هاشم بەری نوکە تە و سوڕەیایێ بەحسێ چ دکر دەمێ هوون چووینە بن گوهێن هەڤدوو و هەوە ب دزیکیڤە دئاخفت؟"

هاشمی بەرسڤ دا:

"وێ گوت ئەز دێ نوکە جلکان بەمە مال ئوتی کەم و دەمێ ئەڤ شەڤە دهێم شیڤی چێکەم دێ دگەل خوە ئینم و پاشی ......"

- و پاشی چ؟ ل سەر ئاخفتنا خوە یێ بەردەوام بە.
- وێ گوت ئەز دێ پیچەکێ ل مالا تە بێهنا خوە ڤەدەم چونکی ل بازاڕی ئەز یا واستیایم.

سوڕەیایێ لێ کرە قێژی و گوتی:

" من وەنەگوتیە، چ ئاخفتنێن ب ڤی ڕەنگی من نەگوتینێ، من گوتێ پشتی ئەز دچمە مال پیچەکێ بێهنا خوە ڤەدەدەم پاشی دێ جلێن هەوە ئوتی کەم و بۆ تە زڤڕینم."

هاشمی سەرێ خوە هەژاند و ڕازی نەبوو زێدەتر چ بێژیت.

ئاها ل ڤێرێ پتر دەلیڤە بۆ عەلی پەیدابوو ئەو هەڤژینا خوە ب درەوین و خیانەتکار دەربێخیت و لێ بکەتە هەوار.

موختاری تەماشەی زەهرایێ کر و پیچەکێ دوودل بوو، پاشی دووبارە پرسیار ژ هاشمی کر:

"هاشم گوهێ خوە باش بدە من، ئەو تشتێ تو دبێژی گەلەك یێ گرنگە، ڤێجا ب ڕاستی بێژە کا سوڕەیایێ گوتبوو تە پشتی ئەو جلێن تە

دئینته مال، دڤێت پیچەکێ ل مالا تە بێهنا خوە ڤەدەت و خوە درێژ بکەت، ئەڤ چەندە ڕاستە یان نە؟"

هاشم یێ دوودل بوو و نەدزانی دێ چ بێژیت، وی سەرێ خوە بلند کر و چاڤێ وی ب عەلی کەفت کو ل پشت موختاری یێ ڕاوەستیایی بوو و ب چاڤان گەف لێدکرن.

- بەرسڤا من بدە هاشم، بێدەنگ نەمینە، ئەو چەندا من گوتی ڕاستە یان نەخێر؟
- بەلێ... بەلێ ڕاستە، وێ ئەڤ چەندە گوتبوو.
- باشە سەحکە من و ئەو تشتێ تە گوتی دووبارە بکە.

هاشم کەسەکێ هەژار و خۆلیسەر بوو و زێدە یێ شەرمین و دەمێ دئاخفت هەر تەڤرەك ل ئەردەکی ددا، دەمێ وی دگەل خەلکی ژی دئاخفتی شەرم دکر سەرێ خوە بلند بکەت، هەکە جارەکێ ئاریشەکا چەند بچووك ژی بۆ وی چێبباپە دا ئەزمانێ وی لاڵ بیت و بۆ ماوەیێ چەندین دەمژمێران نەدشیا باخڤیت، هەرچەندە موختاری باش دزانی هاشم یێ هۆسایە لێ وی دڤیا بەرسڤەکا یەکلاکەر ژ وی وەربگریت.

پاشی موختاری گوتێ:

"هاشم باش گوهێ خوە بدە من و نەترسە، ئەڤە ژ مێژە ئەم تە دنیاسین و تو گوندیێ مەی و ئەز وەکی بابێ تەمە، ژبەر هندێ نوکە سەحکە من و بۆ دوماهیك جار بێژە بەلێ یان نەخێر."

هاشمی پاشی سەرێ خوە بلند کر داکو تشتەکی بێژیت، لێ دیت زەهرا و سوڕەیا هەردوو  ب چاڤێن گرێ یێن تەماشەی وی دکەن لەوڕا نەوێریا چ پەیڤان بێژیت.

ئیبراهیمی ب تۆڕەیی ڤە لێ حەیتاند و گوتێ:

"دێ بۆ جارا دوماهیێ پرسیارێ ژ تە کەم، هزرا خوە باش بکە بەری بەرسڤێ بدەی، ئەرێ ڕاستە سوڕەیایێ دڤیا بێهنا خوە ل مالا تە ڤەدەت پشتی کو ب شەڤێ جلێن تە دزڤڕینیت؟ ئەڤ چەندە ڕاستە یان نە؟"

دەمێ عەلی دڤیایی هندەك هێمایان بدەتە هاشمی داکو باخڤیت، چاڤێ زەهرایێ ڤێ کەت و گوتێ تو مایێ خوە د وی نەکە، بهێلە ئەو ڕاستیێ بێژیت.

هاشمی گوت:

"بەلێ ئەڤ ئاخفتنە هەموو ڕاستن، وێ دڤیا بهێتە مالا من و بێهنا خوە ڤەدەت هەروەکی وێ گەلەك جارێن دی ژی وەکری، ئەو بەردەوام دهاتە مالا من و بۆ ماوەیەکێ درێژ ل دەڤ من دما، هەرچەندە ئەڤ تشتە ب دلێ من ژی نەبوو، هەروەسا دەمێ کەس ل وێرێ نەبا دا چیتە سەر تەختێ من یێ نڤستنێ و خوە درێژ کەت و هندەك ئاخفتنێن بالکێش دگوتنە من، نوکە من هەموو تشت بۆ هەوە گوتن و ئەڤە ڕاستیە."

ل وی دەمی سوڕەیایێ قەت باوەر ژ وان ئاخفتنان نەدکر یێن دهاتنە گوهێن وێ، وێ گوت:

"ئەڤە درەوە، من چ جاران خوە ل مالا تە گیرۆ نەکریە، دەرگەهـ ژی هەموو گاڤان من دهێلا ڤەکری، یا خودا ئەز چ بکەم دا ئەڤ خەلکە ژ من باوەر بکەن، ئەز ب خودایی سووند دخوۆم ئەڤ تشتێ هاشم دبێژیت هەموو یێ چێکریە و درەوان دکەت."

پاشی وێ بەرێ خوە دا هاشمی و گوتێ:

"تو بۆچی ڤێ دئینیە سەرێ من، تو دزانی ئەز وەکی برایێ خوە حەز ژ تە دکەم و فەیروز ژی وەکی خووشکا من بوو، بۆچی تو نوکە هاتیە گوهۆڕین و تە دڤێت زیانێ بگەهینیە من؟"

بۆ ماوەیەکی هەموو بێدەنگ بوون، هاشمی دووبارە دەست ب تومەتێن خوە کرەڤە پشتی کو عەلی ب چاڤان هندەك گەف لێکرین:

"حەجی ئیبراهیم، هەر تشتێ من گوتی ڕاستە و ئەز سووند دخوۆم، سوڕەیا بەردەوام دهاتە مالا من خوە هەکە ئەز پێدڤی وی نەبامە ژی و عەلی ژی ڤێ چەندێ دزانیت و بەری نوکە من گوتبوویێ، هەروەسا مەلا حەسەن ژی ڤێ چەندێ دزانیت و من دگەل وی ژی ئاخفتبوو."

پشتی هینگێ هاشمی سەرێ خوە شۆڕکر، هەروەکی وی هەست ب شەرمێ و ترسێ کری ژ وان تشتێن وی بەری نوکە گوتین.

ئیبراهیمی دەستێ خوە دناڤ ڕهێن خوە دا ئینانە خوارێ و تەماشەی عەلی کر و گوتێ:

"ئەرێ ئەڤە ڕاستە؟ تە ژی ئەڤ چەندە دزانی؟"

عەلی بەرسڤا وی دا و گوت:

"بەلێ حەجی ئیبراهیم، لێ من نەدڤیا ڤێ چەندێ باوەر بکەم چونکی ئەز حەز ژ هەڤژینا خوە دکەم، ژبەر هندێ ئەز نەدشیام ڤان تشتان هۆسا ب سانەهی باوەر بکەم. بەری نوکە مەلا حەسەنی و گەلەك ژ خەلکێ گوندی ژی گوتبوو ب تایبەت پشتی ئەز ژ کرمانێ زڤڕیم، لێ من هەر باوەرنەدکر هەتا کو ب چاڤێن خوە نەبینم و ئەڤرۆکە من ئەو چەندە ب چاڤ دیت."

- تە ئەڤرۆکە چ تشت دیت؟ کا دووبارەکەڤە.
- من دیت ئەو یێن ل بن گوهێ هەڤدوو دئاخڤن و دکەنە کەنی، هەروەسا من دیت وان دەستێن یەك یێن گڤاشتین، ئەو چوو بن گوهێ وی و تشتەك گوتێ. ئاها من ئەڤ چەندە ب چاڤ دیت.

جارەکا دی سوڕەیایێ ئاخفتنا وی بڕی و گوتێ:

"من دەستێ وی نەگرتیە و نەچوویمە بن گوهێ وی ژی، دبیت مە ب هەڤدوو کربیتە کەنی بەلێ بیرا من ناهێت وەکی دی ژی ئەز کەیفا خوە ب هەموو گوندیان دئینم و بۆ دکەمە کەنی و ڕوویێ خوە لی ڤەدکەم ب تایبەت هەکە مرۆڤێن باش بن".

ئیبراهیمی گوت:

"د ڤێ ژورێ ڤە دوو زەلام یێن تە گونەهبار دکەن ب کارەکی کو ئەو کار نە ژ هەژی ژنەکا ب هەڤژین و زارۆکە، ئەرێ تە بەلگە هەنە بەروڤاژی ئاخفتنا وان ب سەلمینی؟"

سوڕەیا گەلەك ژ ڤێ پرسیارێ مەندەهۆش ما و ئەزمانێ وێ لاڵ بوو، پاشی گوت:

"بەروڤاژی ئاخفتنا وان بسەلمینم؟ مەرەما تە چیە؟ ل سەر من یا پێدڤیەنینە كو ئەز بەروڤاژی ئاخفتنێن وان بسەلمینم، بەلكو ل سەر وان یا پێدڤیە هندەك بەلگەیان بینن كا كەنگی من ئەڤ كارە كریە؟ ل كیڤە؟ چەوا؟ ئەوان چ بەلگە ل سەر ڤان تومەتێن خوە هەنە؟ ئەز ژنەكا پاقژم و من چ زەلام د ژیانا خوە دا نەنیاسینە ژبلی هەڤژینێ خوە. ئەگەر هوون من ب دووگیانیێ ژی تومەتبار بكەن، دڤێت هوون خوە نەهـ هەیڤان ل هیڤیا من بگرن دا بزانن كا ئەز ڕاست دبێژم یان ئەو."

ئەو گوتنا دوماهیێ بۆ جهێ تۆڕەبوونا موختاری چونكی وی پێشبینیا وێ گوتنێ نەدكر، پاشی ل سەر ئاخفتنا خوە بەردەوام بوو و گوت:

"سۆڕەیا خان سوڕەیا هۆسا دیارە تە یاسایێن جڤاكێ مە یێن ژبیركرین ئەوێن ئیمامێ مە بۆ مە دانایین، دەمێ زەلام هەڤژینا خوە ب كارەكێ خراب گونەهبار دكەت، پێدڤیە هەڤژینا وی بەروڤاژی ئاخفتنێن وی بسەلمینیت، لێ هەكە ژنەك هەڤژینێ خوە گونەهبار بكەت، پێدڤیە هەڤژینا وی ب خوە بەلگەیان بینیت، تو نوكە د یاسایێن مە گەهشتی؟ ئەو یێن دبێژن تو گونەهباری، ڤێجا ل سەر تە پێدڤیە تو هندەك بەلگەیان بینی و ئاخفتنا وان ب درەو دەربێخی، وێ گاڤێ ئەم دێ باوەر ژ تە كەین."

ل ڤی دەمی زەهرایێ دەست ب ئاخفتنێ کر کو هەتا وی دەمی ژی یا بێدەنگ بوو و ب تنێ ژ گوهداران بوو، وێ گوت:

"ئیبراهیم ئەم هەموو هەڤدوو باش دنیاسین و کەس نەشێت درەوان ل یێ دی بکەت، ئەرێ ما تو ژی نە دگەل منی؟ ئەم هەموو دزانین کو بێهنا پیلانەکێ یا ژ ڤی کاری دهێت، ل سەر سوڕەیایێ یا پێدڤی نینە چ تشتان بسەلمینیت، ئەو دایکەکا سەرکەفتی و خۆڕاگر و هەڤژینەکا دلسوزە، ئەڤە هەڤالاً وێ فەیروزە مری ئەو یا هاریکارییا خێزانا وێ دکەت، دگەل ڤێ هەموویێ ژ نوو تو دهێی پرسیارێ ژێ دکەی کا ئەو هەڤژینەکا دلسوزە یان نە."

تو دزانی تو یێ هندەك پرسیارێن تامسار دکەی؟ ئەرێ ئەگەر ئەڤە کچەکا تە بایە دا تو هەمان پرسیار ژێ کەی؟ هەلبەت تە ئەڤ چەندە نەدکر. تو باش دزانی سوڕەیایێ چ شاشی نەکرینە، لێ تو کەسەکێ ترسنوکی و تو نەوێری ڕاستییێ بێژی."

ئیبراهیمی باوەر نەدکر زەهرا هۆسا دێ وی ڕەزیل کەت، بێهنا خوە فرەهکر هەتا ئەو ئاخفتنا خوە ب دوماهی دئینیت، پاشی وی گوت:

"پشتڕاست بە ئەگەر کچەکا من کارەکێ هۆسا کربایە، قەت ئەز لێ نەدبوریم و دا هەمان وی کاری کەم یێ نوکە ئەز پێ ڕادبم، پۆستێ من وەك موختارێ گوندی من نەچار دکەت ئەز ب ڤی کاری ڕابم خوە هەکە ئەڤ چەندە یا ب دلێ تە بیت یان نە، ئەڤ ژنە یا تاوانبارە ب خیانەتا هەڤژینییێ. ئەز دزانم نوکە ئەڤ دەنگوباسە گەهشتیە گوهێن مەلای ژی و نوکە دێ چمە دەڤ وی و دێ بڕیارێ ل سەر ڤێ چەندێ دەین."

پشتی هینگێ موختاری ژ مالا وێ دەرکەفت بێی کو خاترا خوە ژێ بخوازیت، پاشی عەلی و هاشم ژی ل دووڤ وی کەفتن و ئەو خەلکێ گوندی یێ ل بەر دەرگەهی ژی نەمانە ل وێرێ.

زەهرایێ نەزانی دێ چ بێژیت ژبەر وێ ڕوودانا چێبووی، سوڕەیا ژی گەلەك ترسیا و پاشی ئاگەهـ ژ خوە نەما و ب ئەردی کەفت، دێمێ وێ هند زەر و پێتی بوو دا بێژی ئەڤە بێهنەکە یا مری.

ترسێ دلێ زەهرایێ ژی گرت، ئەوێ هەر ژ بچووکاتی سوڕەیا ژ کچێن خوە پتر دڤیا و گەلەك گرنگی ددایێ، لێ نوکە دەستێن وێ ژی یێن هاتینە گرێدان و نزانیت دێ چەوا سوڕەیایێ ژ ڤێ ئاریشەیێ قورتال کەت چونکی سوڕەیا ب خوە ژی نەشێت بەرەڤانییێ ژ خوە بکەت دژی وان تومەتێن ب دووڤ وێ ڤە هاتینەنان.

زەهرایێ چ جاران دانپێدان ب دەستهەلآتا زەلامان نەدکر و هەموو گاڤان بێی هزرەکێ بۆ یەکی بکەت بۆچوونا خوە دگوت و کەس نەدوێریا ئاخفتنا وێ بشکێنیت یان بەروڤاژی بۆچوونا وێ تشتەکی بێژیت.

لێ پشتی پەیدابوونا شۆڕەشێ، ئێدی هەموو تشت چوونە د دەستێ زەلامان دا و وان ب تنێ بڕیار ددان، زەهرایێ ژی هەست ب شکەستنێ دکر و نەدشیا بەرهنگاری ڕێکا ئیمامی و شۆڕەشا وی یا نوو ببیت، هەر ئاخفتنەکا ئەو بێژیت یان کارەکی بکەت کو دژی ئیمامی و بڕیارێن وی بیت، دێ ئەو تووشی گەلەك سزادان و ئاریشەیێن مەزن بیت.

پشتی هاتنا مەلا حەسەنی بۆ ناڤ گوندێ کوبایێ، دا بێژی ئێدی ئەهریمەن یێ هاتیە دناڤ گوندی دا و کەس نەشێت وی بدەرێخیت، ژبەرکو

مەلا یێ خواندەڤان بوو و هندەك زانین ل دەڤ هەبوو لەوڕا هەر تشتێ وی گوتبایە خەلکی باوەر ژێ دکر.

هەرشەڤ زەلام پشتی ژ کارێن خوە ب دوماهی دهاتین دا چنە دیوانا وی، ئەو ژی دا بەحسێ ماف و ئەرکێن وان بۆ کەت و دا بێژیتی کو نابیت زەلام هند دەلیڤەیێ بدەتە ژنێ و دڤێت ئازادیا وێ سنووردار بکەت و نەهێلیت مایێ خوە د هەموو تشتان بکەت، پشتی بورینا چەند سالەکان، زەلامێن گوندی ب یەکجاری هاتنە گوهۆڕین و هەر زەلامەکێ تە دیتبا کێرەك یان قەمەك یا د بەر پشتا وی ڕا و ئێدی گەلەك نەخۆشی بۆ ژن و هەڤژینێن خوە پەیدا دکرن.

ل وی دەمی مەترسی ل سەر ژیانا کچ و ژنێن گوندی زێدەبوو ب تایبەت ژنێن وەکی سوڕەیا و فەیروزە و کەوکەب و گەلەکێن دی، لەوڕا ئەو نەچار بوون زوو ب زوو ژ مالێن خوە نەدەرکەڤن هەتا دووبارە موختارێ گوندی شیایی کونتڕۆلێ ل سەر گوندی بکەتەڤە، لێ دگەل هندێ ئەڤ مەترسیە ب یەکجاری ب دوماهی نەهات بەلکو چەندین زەلام هێشتا مابوون ب ئاوایەکێ توند گەف ل ژنان دکرن و ب بۆچوونا وان نوکە دەلیڤە هاتیە ئەو ئایینی ئیسلامێ ب تەمامی پەیڕەو بکەن ژبەرکو ئەڤە چەندین سالە هاتیە بپشتگوهـڤە هاڤێتن.

مەلا حەسەنی وەختێ دناڤ گوندی ڕا هات و چوون دکر، هۆسا هزردکر ئەو پێغەمبەرەکە یێ ژ دەڤ خودایی هاتی داکو پەیڤا ڕاستیێ دناڤ خەلکی دا بەلاڤ بکەت، لێ وی قەت هزر نەدکر کەسەکا وەکی زەهرایێ دێ د ڕێکا وی دا ڕاوەستیت و بیتە مەزنترین هەڤڕك و دوژمنا وی، زەهرایێ

چ پووتە ب مەلای نەدكر و قەت مێهڤان نەدكرە مالا خوە.  جارەكا كێم نەبیت هەكە چ جاران دگەل نەئاخفتبوو ژی.

پشتی بورینا ماوەیەكی، زەهرایێ هەستپێكر كو ئەڤ مەلایە ئێدی جهێ مەترسیێ یە، هەروەسا وێ زانی كو مەلای داخواز ژ سورەیایێ كریە شوو ب وی بكەت چونكی عەلی هەڤالەكا دی ل باژێری یا هەی و دڤێت هەڤژینا خوە بەردەت ژبەر هندێ ئەو یێ ئامادەیە هەر كارەكی بكەت داكو هەڤژینا خوە بەردەت بێی كو مەهرا وێ بۆ بزڤرینیت.

پشتی موختار و عەلی ژ مالا زەهرایێ چووین، وێ گوت:

"خۆشتڤیا من سورەیا، نوكە ئەز و تو یێن ماینە ب تنێ، نوكە بۆ من ڕاستیێ بێژە، ئەرێ ڕاستە تشتەكێ هۆسا دناڤبەرا تە و هاشمی دا ڕوودایە؟"

وێ سەرێ خوە بلند كر و ب دێمەكێ بێگونەهـ تەماشەی خالەتا خوە كر و گوتێ:

"خالەتا من، چەوا تو ڤێ پرسیارێ ژ من دكەی ل دەمەكی كو تو من ژ خوە باشتر دنیاسی؟"

- من باوەری ب تە هەیە، لێ من پرسیاركر داكو بەرسڤێ ژ دەڤێ تە ب خوە گوهلێببم.
- نەخێر، نەخێر، چ تشتێ هۆسا نە دناڤبەرا من و هاشمی و نە چ زەلامێن دی دا ڕوونەدایە، من چ جاران هزرا خوە د كارێن خراب دا نەكریە چونكی دایك و بابێن من

ب جوانی ئەز یا پەروەردە کریم، ئەز ژنەکا شەریفم و هندی یا ساخ بم دێ یا ب ڤی ڕەنگی بم.

هەرچەندە زەهرا یا پشتڕاستبوو خوارزایا وێ یا بێگونەهە، لێ وێ دڤیا ئەو ب خوە ڕاستیێ بێژیت و پاشی دەستێ خوە ب پرچا وێ دا ئینا خوارێ و گوتێ:

"نەترسە کچا من، زەلامێن ڤی سەردەمی یێن دین بووین، ئەو ژی نزانن کا ئەو چ دکەن یان چ دبێژن."

پشتی هینگێ دەنگێ قەرەبالغا هندەك ژنان ژ دەرڤە هات، پشتی دەرگەهـ هاتیە قوتان، زەهرا چوو دەرگەهی ڤەکەت و دیت کۆمەکا ژنێن گوندی جلێن ڕەش یێن کرینە بەر خوە و یێن د هەوارا سوڕەیایێ هاتین ژ وان ژی "سەکینا" هەڤژینا مەسعودێ سەرتڕاش و "ڕەباب" هەڤژینا کەریمێ سۆفی چنێ پەزی.

یەك ژ وان گوت:

"موختارێ گوندی داخواز ژ مە کر ئەم بهێنە دەڤ هەوە چونکی نوکە ئەو یێ زەلامێن گوندی کوم دکەت داکو ل سەر ڤی بابەتی گەنگەشەیێ بکەن و بڕیارەکێ بدەن."

زەهرایێ خوە بێدەنگ کر چونکی ئەو د ڕامانا ڤێ گەنگەشەیێ دگەهیت، موختاری نێزیکترین شیرەتکارێن خوە یێن کۆمکرین داکو بگەهنە بڕیارەکێ، پاشی زەهرایێ پرسیار ژ وان ژنان کر:

"ئێ باشە کی دگەل موختاری بوو؟"

ژنەکێ بەرسڤا وێ دا:

"مەلا حەسەن لاجیفاردی و هێژا مورتەزایێ ڕەمەزانی و عەلی و هەردوو کوڕێن وی یێن مەزن و هاریکارێ موختاری شوکرللاھـ، هەروەسا دانعەمرێ نابین، ئەز دبێژم هەما ب تنێ ئەڤە بوون.

ئەڤ زەلامە ل سەر هندێ د ڕژد بوون کو شەریعەتێ ئیسلامێ بجهـبینن بێی کو تشتەك ببیتە ڕێگر ل هەمبەری وان، لێ د ڕاستی مەرەما وان یا سەرەکی ئەڤە نەبوو بەلکو ب تنێ وان پیلانەك دانابوو داکو ژیانا سوڕەیایێ ب دوماهی بینن، چونکی خوە هەکە وێ گاڤێ سوڕەیایێ سەد بەلگە ژی ئینابان و بێگونەهیا خوە دیارکربا ئەو هەر دا وەکی خوە کەن.

زەهرایێ نەدزانی کا ل دوماهیا گەنگەشەیا خوە ئەو دێ گەهنە چ بڕیار ژبەرکو بڕیارێن موختاری هەموو گاڤان ژ سنوورێ هندێ نەدبورین کو سزادانێن پارەی یان ژی هندەك جاران تاوانبار نەچاردکر هاریکاریەکێ پێشکێشی گوندیان بکەت.

لێ تشتێ چاڤەڕێنەکری ئەوبوو دەمێ زارۆکەك هاتی دەرگەهێ زەهرایێ قوتایی و هاتیە د ژوور ڤە و گوتیێ کو خەلك هەموو یێ ل بەر دەرگەهێ کۆچکا موختاری خڕڤەبووین و هۆسا دیارە وان سزایەکێ مەزن بۆ سوڕەیایێ یێ بەرهەڤکری چونکی هێدی هێدی خەلك هەموو یێ بەرەڤ گوڕەپانا گوندی ڤە دچن.

زەهرایێ ژنەك فرێکرە ناڤ گوندی داکو بزانیت کا ئەو دێ چ بڕیار دەن، لێ ئەو ژنە ب دەنگوباسەکێ گەلەك نەخۆش ڤە زڤڕی ژبەرکو

وێ گوت خەلك يێ داخوازا بجهئينانا فەرمانا بەربارانكرنێ ئانكو ڕەجماندنا هەتا مرنێ دكەن.

زەهرايێ زوو دەستێ سوڕەيايێ گرت و ئەو برە د ژوورا نڤستنێ ڤە و بەحسێ وی سزايێ گران كر يێ كو پشتی بێهنەكا دی دێ ل سەر وێ هێتە بجهئينان، پشتی هينگێ زەهرايێ بەحسێ ڕەنگڤەدانا سوڕەيايێ نەكريە ب تنێ ئەو نەبيت كو بێهنا وێ يا فرەهـ بوو و بزاڤ نەدكر بێگونەهيا خوە ديار بكەت.

پاشی زەهرايێ دياركر و گوت:

"ئەز دزانم ئەو يا بێگونەهە ژ وێ تاوانا بۆ وێ هاتيە دروستكرن، ئەو نە پێدڤی ب هندێ يە بۆ من بێگونەهيا خوە ديار بكەت و ئەم هەموو ژ ڤێ چەندێ د پشتڕاستين، لێ مخابن چ تشت نەبووينە ڕێگر ل هەمبەر وێ بڕيارا نەدروست يا زەلامان ب لەز دايی و بجهئيناى."

دەمێ خەلكی پرسيار ژ زەهرايێ كری كا بۆچی وێ كراسێ خوە يێ بووكينيێ يێ سپی كرە بەر سوڕەيايێ ژبەركو ئەو چەندين سال بوو وێ ئەڤ كراسە هەلگرتی، هەتا دەمێ كچێن وێ ژی شوو كری وێ ئەڤ كراسە نەئينابوو دەر، وێ گوت:

"وێ سپێدێ سوڕەيايێ هندەك جلێن سادە و بێ سەروبەر كربوونە بەر خوە دەمێ چوويە بازاڕی، لێ دەمێ من زانی كو زەلامان بڕيارا خوە يا داى و ناهێلن ئەو بچيتە د مالا خوە ڤە، من كراسێ خوە يێ بووكينيێ كرە بەر داكو ئەو ب كراسێ سپی بەرامبەر هەموو وان كەسان ب سەربلندی براوەستيت يێن ئەو گونەهباركری ب خيانەتا هەڤژينيێ،

ژبلی من کەسێ ئەڤ کراسە ل بەر خوە نەکریە ژبەر هندێ من دڤیا هوون بزانن کو سورەیا ب تنێ ژ هەژی ڤی کراسی یە."

ژنێن گوندی هەموویان دەست ب گریێ و دوعایان کرن، ئەو ل سەر ڤێ چەندێ راهاتبوون ژبەرکو دەمێ دبوونە بەهی و کەسەك مربایە ژی وان ب ڤی رەنگی دەربرین ژ نەخۆشیا خوە دکر.

هەرچەندە دەمژمێرێن وێ رۆژێ گەلەك هێدی و ل سەر خوە دبورین، دەمێ بویە ئێڤار، هەوارێن زەلامان بلند بوون و دگوتن:

"ئەو ژنەکا دەهمەن پیسە، ئەم ل وێ نابورین، دڤێت ئەو بهێتە رەجماندن."

پاشی هندەکان بەر دانانە دەرگەهێ وان، دەرگەهـ هاتە قوتان و ژنەك چوو دەرگەهـ ڤەکر دیت مریەما هەڤژینا سەعیدێ بیرێن گوندی دکۆلیت و ئیکراما هەڤژینا مەهدیێ گوشتفرۆش هاتنە ژوور ڤە.

مریەمێ گوت:

"زەلام ب دوماهی هاتن و گەهشتنە برپارەکێ."

پاشی مال بجهـ هێلا و زڤرینە وی جهێ ژێ هاتین.

# بەشێ پێنجێ

دەرگەهێ ئاڤاهیێ داری یێ وی خانی هاتە ڤەکرن یێ کۆمبوون تێڤە هاتیە ئەنجامدان.

خەلك هەموو چوونە بن گوهێن هەڤدوو و پرسیار دکر کا چ بڕیار ل دور سوڕەیایێ هاتیە دان، ل وێ سپێدێ خەلکێ گوندێ کوپایێ هەموویان کار و شوولێن خوە هێلابوون و چاڤەڕێی هندێ بوون کا ئەڤ ڕوودانە دێ چەوا ب دوماهی هێت.

موختارێ گوندی ژ خانی دەرکەفت و ل دووڤ وی دا مەلایێ گوندی ژی دەرکەفت. پشتی وان هەردووکان زەلامەکێ دانعەمر هاتە ژ دەرڤە کو هندەك جلوبەرگێن بێ سەروبەر و پیس ل بەربوون و یێ پشت خوار بوو و گوپالەك د دەستی دا بوو، ڕهێن وی یێن سپی و درێژ دێمێ وی یێ قورمچی ڤەشارت بوو، دەمێ موختار و مەلا ژ دەرەجکان هاتینە خوارێ، ل پشت خوە زڤڕین و ب ڕێزگرتن ڤە تەماشەی وی زەلامێ دانعەمر کرن.

زەلامێ دانعەمر ب دەنگەکێ نزم و ترس ڤە گوت:

"ئەو یا گونەهبارە."

ل وی دەمی، دەنگێ گازی و هەوارێن خەلکی بلند بوو و هندەکان دەست هاڤێتنە تڤەنگان و گوللە هاڤێتن، هەروەسا دەنگێ ڕەوینا سەیێن

گوندی ژی هند بلند بوو و ترسەکا مەزن ئێخستە دلێ زارۆکان، هەموویان پێکڤە دکرە هەوار و دگوتن:

"گونەهبارە، ئەو یا گونەهبارە."

هێدی هێدی دەنگی ڤان گازی و هەوارێن خەلکی بلندتر لێ دهات چەند ئەو پیرەمێرێ دانعەمر ژ دەرەجکان هاتبایە خوارێ و نێزیکی خەلکی دبووی، موختاری و مەلای هەردووکان هاریکارییا وی دکر و دەستێ وی گرتبوو هەتا شیایی ژ دەرەجکان بهێتە خوارێ و پاشی رێك بۆ وی ڤەکر داکو بشێت دناڤ خەلکی را ببوریت.

مورتەزایێ رەمەزانی، ئەو پیرەمێرێ دانعەمر، رازی بوو فەرمانا رەجماندنێ ل سەر کچا وی سورەیایێ بهێتە سەپاندن.

پشتی هینگێ خەلك هەموو بێدەنگ بوون، ل وی دەمێ کەسێ چوارێ هاتنە ژ دەرڤە کو ئەو ژی عەلی بوو، ئەوی ژی هێدی هێدی پێنگاڤ دهاڤێتن و ب دەنگەکێ بلند گوت:

"رەجماندن، ئەو دێ هێتە رەجماندن."

پشتی هینگێ هێسترپایەکا تەمام ب سەر وی خەلکی دا هات و هند کەیفا وان هات دا بێژی جەژنە.

عەلی ژی یەك بوو ژ وان کەسان یێن فەرمانا رەجماندنێ ل سەر هەڤژینا خوە دایی، نوکە ئەو گەلەك یێ کەیفخۆشە و هزر دکەت ژ کەیفا دا دنیا هەموو تێرا وی ناکەت، ئەو سێ دەرەجکان هاتە خوارێ و یەکسەر زەلامان خوە تێوەرکر و پیرۆزباهی لێکر، پاشی کۆمەکا زەلامان ئەو

هەلگرت و بلندکر هەروەکی کا چەوا زاڤا ل شەڤا خەنایێ ژ لایێ هەڤالێن خوە ڤە دهێتە بلند کرن.

پشتی هینگێ خەلکی ئاگەهـ ژ کەسێن دی نەما یێن ژ نوو ژ خانی دەرکەفتین، ئەو ژی  هەردوو کوڕێن عەلی بوون کو یێ بچووك ژیێ وی شازدە سال بوون و یێ مەزن ژیێ وی هەژدە سال بوون، هەروەسا هاریکارێ موختاری و زەلامەکێ دی یێ دانعەمر بوون.

دەنگێ خەلکێ بلند بوو و هەموویان پێکڤە دگوتن:

"ڕەجماندن، ڕەجماندن، ڕەجماندن!"

خەلکێ گوندی هەموویان پێکڤە ئەو ڕۆژە وەکی هەلکەفتنەکێ ساخکر و پاشی هێدی هێدی بەرەڤ نیڤا گوندی چوون هەتا گەهشتینە بەر دەرگەهێ مالا بابێ سوڕەیایێ، ل وی دەمی دنیا گەلەك یا گەرم بوو و تیشکا ڕۆژێ یا دژوار خوەهـ ژ ناڤچاڤێن وان دئینانە خوارێ و تۆز ژ ئەردی رابوو.

ژبلی وان زەلامێن کو هندەك جلێن بێ سەروبەر و پیس ل بەر بوون، کۆمەکا ژنان ژی ب عەبایێن ڕەش هاتبوونە وێرێ، هەروەسا زارۆکێن گوندی ژی ب خوینگەرمی و جۆش و پەرۆشەکا مەزن ل وێرێ خڕڤەببوون و هەموویان بەر ب دەستێ خوە هەلگرتبوون.

پشتی سزایێ ڕەجماندنێ ل سەر سوڕەیایێ هاتیە سەپاندن، نەهـ زەلام هاتبوونە ڕاسپاردن ژ بۆ بجهئینانا ڤی سزایی. موختاری داخواز ژ وان کر بێدەنگیێ بپارێزن، پلا گەرماتیێ هند یا بلند بوو، وان دڤیا زوو ڤی سزای بجهبینن و هەر یەك بچیتە سەر کارێ خوە.

ل دووڤ دا موختاری گوت:

"هیڤی دکەین بێدەنگ بن، نوکە گوهێ خوە بدەنە من دا ئەز بۆ هەوە تشتەکێ گرنگ بێژم."

وی سێ جاران ئەڤ ئاخفتنا خوە دووبارە کر هەتا خەلك بێدەنگ بووی و گوهداریا ئاخفتنێن وی کری، ل دووڤ دا وی گوت:

"گوندییێن من یێن خۆشتڤی، ئەڤرۆکە ئەم یێن ل بەر دەرگەهێ مالا هەڤالێ مە یێ هێژی مورتەزاییێ ڕەمەزانی خرڤەبووین، ئەڤرۆکە ئەو بێ شانسترین کەسە ل سەر ڕوویێ ئەردی و ژ هەموویان پتر هەست ب نەخۆشی و بێهنتەنگییێ دکەت."

دیسان دەنگێ گازییێن خەلکی بلند بوو و دگوتن:

"بەلێ تو ڕاست دبێژی، ئاخفتنا تە یا دروستە، هەی مورتەزاییێ هەژار."

دووبارە موختاری داخواز ژێ کر بێدەنگ ببن و گوت:

"هیڤی دکەم بێدەنگ ببن، گوهێ خوە بدەنە من کا ئەز دێ چ بێژم."

ل دوماهیێ دووبارە هەموو بێدەنگ بوون. موختاری گوت:

"مورتەزا هەڤال و هەڤسوویێ مەیە و یەکە ژ گوندیێن ڕەسەن و ئەڤە چەندین سالە دگەل مە دژیت، ئەو یێ ل ڤێرێ هاتیە سەر دنیایێ و بەری هینگێ باب و باپیرێن وی ژی هەر ل ڤی گوندی هاتینە سەر دنیایێ.

هەر ل ڤی گوندی، هەموو ئەندامێن خێزانا وی یێن هاتینە ڤەشارتن و کەسێ گوند بجهـ نەهێلایە."

دیسان خەلکی کرە گازی:

"بەلێ ڕاستە، ئەڤ ئاخفتنا تو دبێژی هەموو ڕاستیە."

موختاری دەستێ خوە بلند کر و گوت:

"لێ مخابن ئەڤرۆکە نامیسا وێ هاتیە پیسکرن، نە بەس ئەڤ چەندە ب تنێ، بەلکو نامیسا گوندێ کوپایێ و یا مالباتێن مە هەموویان هاتیە پیسکرن."

ئەڤ جارە خەلکی ب دەنگەکێ بلند و تۆڕە کرە هەوار:

"ڕاستە، ڕاستە، ڕاستە."

پشتی بێدەنگیێ خوە ب سەر وان دا گرتی، دیسان موختاری دەست ب ئاخفتنێ کر و گوت:

"ئەڤە هەموو تشت نەبوون، بەلکو تشتێن خراپتر ژی یێن هەین. نامیسا مورتەزای یا ب وی و خێزانا وی ب تنێ ڤە گرێدایە، هەروەسا نامیسا مە ژی ب مە ب تنێ ڤە یا گرێدایە و ئەم دزانین کا دێ چەوا شێن نامیسا خوە پاقژ کەین، لێ تشتەکێ خراپتر ژ ڤێ چەندێ یێ هەی ئەو ژی سڤکاتی ب خودایێ مەزن و ب نامیسا مەلایێ مە یێ هێژا هاتیە کرن."

ئاها ل ڤێرێ بارۆڤەکا ڤێژی و هەوار و گازیان ژ وی خەلکێ ل وێرێ خڕڤەبووی هات کو هژمارا وان نێزیکی دوو سەد کەسان بوون، ژنان

دکرنە گری و زەلامان دکرنە هەوار و زارۆکان ژی تەپ ل سینگێ خوە ددان وەك نیشانەك بۆ پەشیمانییێ، هەموویان ب دەنگەکێ بلند دگوتن:

"دڤێت ئەڤ لەشفرۆشە بمریت، مرن بۆ وێ پیرۆز بیت، نەفرەت ل سەر گیانێ وێ بن."

هەرچەندە گەلەك جاران موختاری داخواز ژ خەلکی دکر بێدەنگیێ بپارێزن، لێ هۆسا دیار بوو کونترۆلکرنا خەلکی ژ دەستێن وی دەرکەفت بوو و کەسێ گوهداریا وی نەدکر، لێ پشتی چەند بزاڤێن بەردەوام ئەو شیا ل دوماهییێ خەلکی بێدەنگ بکەت.

موختاری گوت:

"ل ڤێ مالا نوکە ئەم ل بەر دەرگەهێ وێ ڕاوەستیاین، مورتەزا و خێزانا خوە ب سەربلندی و نامیسەکا پاقژ تێڤە دژیان."

خەلکی ئەو بڕی :

"سوپاسی بۆ خۆدایێ مەزن و دلۆڤان بن."

دیسان وی بەردەوامی دا ئاخفتنا خوە:

"ژبەر هندێ نوکە و هەر ل بەر ڤی دەرگەهی، ئەم دێ وی سزایی بۆ هەوە خوینین یێ مە بڕیار ل سەر دایی. ل بەر ڤی دەرگەهی، مورتەزا و خێزانا خوە جارەکا دی دێ نامیسا خوە زڤڕینن و ب سەربلندی دناڤ مە دا ژین."

— سزادان، سزادان، سزادان.

کەرب و تۆڕەبوونەکا مەزن ل سەر دێمێ زەلامان هەبوو و هندەکان دەستێن خوە ژبەر کەرب و کینێ ب هێز گڤاشتبوون، ژنێن گوندی ژی ژبەر شەرمێ، دەرسوکێن خوە دابوونە بەر دەڤێ خوە و دکرنە گری.

- ڕەجماندن، ڕەجماندن، ڕەجماندن، هەر نوکە دڤێت وی ب ڕەجمینین.

موختاری بەرسڤا وان دا و گوت:

"ئەز هەست پێ دکەم کا نوکە بۆ هەوە ژی چەند نەخۆشە، لێ دڤێت هوون پیچەکێ د بێهنفرەهـ بن، ژبەرکو دڤێت ئەڤ چەندە ل دووڤ یاسایێ و ڕاسپاردەیێن ئیمامێ مە یێ مەزن بهێتە بجهئینان."

- تو ڕاست دبێژی، ئەو نە یا ژ هەژی یە بژیت، دڤێت نوکە بهێتە ڕەجماندن، هەر نوکە بێی گیرۆبوون.

پشتی ڤێ چەندێ موختاری ب تەمامی کونترۆلا ل سەر گوندیان ژ دەستدا، وی دیت دێمێن وان یێن ژبەر کەرب و کینێ هاتینە گوهۆڕین تا وی ڕادەی ئەو ل بەر چاڤێن وی وەکی هندەك کەسێن نەنیاس لێ هاتبوون. ئەرێ ڕاستە ئەڤە هەر ئەو کەسن یێن سپێدێ زوو ژ خەو هشیاربووین ژبەرکو ئەڤرۆکە ڕۆژا بازاڕکرنێ یە؟

ب دووراتیا نێزیکی مەترەکێ ژ موختاری، مەهدی یێ گوشتفرۆش، کو پسمامێ هەڤژینا وی بوو، یێ ڕاوەستیایی بوو و کەرب ژ ناڤچاڤێن وی دفڕی، هەروەسا ب ڕەخ وی ژی ڤە ڕەسولێ دارتاش داخواز

دکر هەر زوو ئەو بهێتە ڕەجماندن داکو ئەو بچیت زوو کارێ خوە ب دوماهی بینیت بەری کو دنیا ببیتە شەڤ.

موختاری کرە گازی:

" هەڤالێن من، بۆ خاترا خودایی گوهێ خوە بدەنە من."

لێ خەلکی دیسان چ پووتە ب ئاخفتنا وی نەکر و جار بۆ جارێ دەنگێ وان بلندتر و ب ترستر لێ دهات.

— کوڕێن من، گوندیێن من، هیڤی دکەم بێدەنگ بن.

ل دوماهیێ خەلك بێدەنگ بوو، موختاری زانی ل سەر وی یا پێدڤیە ئەو زوو سزایێ ڕەجماندنێ بجهبینیت بەری کو شوول ژ دەستێ وی دەربکەڤیت، چونکی دوور نینە کەسەکێ نەگوهدار هێرشێ بکەتە سەر وێ مالێ یا سوڕەیا تێڤە، ژبلی هندەك ژنان کەسێ دی ل وێرێ نەبوو و کەسێ زێرەڤانیا وێ مالێ نەدکر.

— هیڤی دکەم ب تنێ گوهێ خوە بدەنە من، تشتەکێ گرنگ یێ هەی دڤێت بۆ هەوە بێژم.

پاشی وی بەرچاڤکا خوە یا کەڤن و گرۆڤر ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ، هەروەسا ب دەستەکێ دی ژی ئەو خوها ل سەر ئەنیا وی پەیدابووی پاقژ دکر، د ڤی دەمی دا ئەو ب خوە ژی گەلەك دترسیا و دەستێن وی دلەرزین.

موختاری گوت:

"نوکە دەلیڤەیێ بدەنە من سزایی بخوینم."

پشتی ڤێ ئاخفتنێ، بێدەنگیەکا تەمام ب سەر خەلکی دا هات. ب ڕەخ موختاری ڤە، مەلا حەسەن و مورتەزایی ڕەمەزانی د ڕاوەستیایی بوون. ل وی دەمی دنیا گەلەك یا گەرم بوو و دندکێن تۆزێ ژی دناڤ بای دا بەلاڤە دبوون.

موختاری بەردەوامی دا ئاخفتنێ و گوت:

"ب ناڤێ خودایێ مەزن و دلۆڤان."

خەلکی کرە هەوار و گوت:

" سوپاسی بۆ تە بن ئەی خودایێ مەزن، خودایێ ب هێز و دادپەروەر."

– ئەڤرۆکە، ڕێکەفتی شەشێ هەیڤا مورردادێ یا سالا 1365 مشەختیێ[4]، جڤاتا باژێرڤانیا گوندێ کوبایێ ب هەموو ئەندامێن خوە ڤە کۆمبوونەك ب سەرۆکاتیا من و هەردوو هاریکارێن من، شوکرللاهێ جەلیلی و موحەمەد عەلی ئەنجامدا.

خەلکی هەموویان دەست بۆ قوتان. پاشی بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتنا خوە و گوت:

---

[4] مورداد هەیڤا پێنجێ یە ئانکو هەیڤا ئەیارێ ل دووڤ سالنامەیا ئیرانێ. ئەڤ ڕێکەفتە دکەڤیتە بەرامبەر 15 تەباخا 1986 زاینی

"کۆمبوونا مە بۆ ماوەیێ چل خۆلەکان ڤەکێشا و ل دوماهیێ ب بڕیارا گشت ئەندامان ئەم گەهشتینە ئەنجامەکی ئەو ژی کو پشتی مە دەلیڤە دایە هەموو ئەندامێن ئەنجومەنی هەر یەك بۆچوونا خوە بێژیت، خوە یەك کەسی ژ ئەندامان بەرەڤانی ژ گونەهبارێ نەکر. مە هەموویان پێکڤە بڕیار دا کو گونەهبار سوڕەیا مانوچەهری...."

خەلکی یەکسەر کرە هەوار:

"نەفرەت ل سەر ناڤێ وێ بن، نەفرەت لێ بن."

دووبارە قەڕەبالغێ دەستپێکر، هەر کەسەکی ژ لایێ خوە ڤە بزاڤکر یێ دی پاڵدەت داکو خوە بگەهیننە ڕێزا پێشیێ، گەلەك ژنان دەست ب ڤێژیان کر و زارۆکان کرە گری.

کەسەکی د ناڤ خەلکی دا ب دەنگەکێ بلند گوت:

"جارەکا دی ناڤێ وێ نەئینە، نەفرەت ل سەر ناڤێ وێ بن، زوو دا ئەم ڤی کاری ب دوماهی بینین و بچینە سەر کارێن خوە. ئەم نەشێن هەتا دەمژمێرەکا دی دەمێ خوە ب هەروە ل ڤێرێ ببورینین."

ل وی دەمی، کەسەکی ژ ناڤ وی خەلکی بەرەك هاڤێت و ب سینگێ مورتەزای کەفت.

موختاری پرسیار کر:

"کێ ئەڤ بەرە هاڤێت؟ ئەوێ بەر هاڤێتی بلا نوکە خوە دیار کەت و بهێتە ڤێرێ."

خەلکی هەموویان سەرێن خوە چەماندن و شەرم ژ خوە کرن ژبەر وی کارێ هاتیە کرن، پاشی کەسەکی مورتەزاییێ دانعەمر بەرەف نافۆرەیا ئاڤێ بر و هندەك ئاڤ ل سەروچاڤێن وی کر و کەسەکێ دی دوشەکەك بۆ ئینا داکو ل سەر بڕوونتە خوارێ. زەلامێ دانعەمر گوت:

"چ نینە ئەز یێ ب سلامەتم، هوون ل سەر کارێ خوە بەردەوام بن، هوون خەما من نەبن."

ل وی دەمی موختار ل دەڤ مورتەزای بوو، پاشی ڕابووڤە و هاتە دەڤ خەلکی و گوتێ:

"هوون شەرم ژ خوە ناکەن، هوون بوونە ئەگەر هەڤالێ مە ئەڤرۆکە دوو جاران هەست ب نەخۆشییێ بکەت، خودا ژبەر ڤی کاری ل هەوە نابوریت. ئەڤرۆکە ژ لایەکی ڤە کچا وی دلێ وی ئێشاند و ژ لایەکێ دی ڤە هەوە، ئەڤ زەلامێ دانعەمر هەموو گاڤان دەرگەهێ مالا وی بۆ مە یێ ڤەکری بوو و هاریکارییا مە هەموویان دکر، ئەو نە ژ هەژی ڤێ چەندێ بوو یا هەوە کری."

ل ڤێرێ، مەلا حەسەنی بۆ یەکەم جار دەست ب ئاخفتنێ کر. ل وی دەمی بێدەنگی ب سەر خەلکی دا هات و هەموویان گوهداریا وی کر، وی تبلا خوە درێژ کرە کەسەکی و گوتێ:

"هێی تو ئەی خۆدانێ قەمیسێ ڕەش کا وەرە ڤێرێ".

خەلکێ ڕێکا وی ڤەکر.

مەلای گوتێ:

"وەرە ڤێرێ، یەلا ب لەز."

ئەو کوڕێ ژیێ وی پازدە سال ب ترس ڤە بەرەڤ مەلای هات کو هێشتا بەرێ تبلا وی یا درێژ کری بوو بۆ ئاراستەیێ وی.

مەلای پرسیار ژێ کر:

"تو کوڕێ "ید الله" ێ شڤانێ پەزی مانە؟"

کوڕك یێ دوودل بوو و چ ئاخفتن ژبەر نەهات. دووبارە مەلای پرسیار ژێ کر:

"بەرسڤا من بدە، نەترسە."

ژ نوو وی کوڕی ب دەنگەکێ نزم و ب ترس ڤە بەرسڤا وی دا و گوت:

"بەلێ."

— باشە تە بۆچی ئەڤ بەرە د مورتەزای وەرکر؟

پشتی بێهنەکێ، وی کوڕکی ب ترس ڤە بەرسف دا:

" من وەنەکریە، ب خودایی من بەر نەهاڤێتیە وی."

بەری ئەو کوڕە بەرسڤا خوە ب دوماهی بینیت، مەلای دەستێ خوە بلند کر و هندی هێز هەی شەقەکا حێل ل بنێ گوهێ وی کوڕی دا، پاشی ئەو کوڕ پشت و پشت ب ئەردی کەفت و تژی دەڤ و لێڤێن وی خوین بوو، هندەك ژ وی خەلکی هاریکارییا وی کر و ئەو ڕاکرەڤە.

مەلای گوتە وی کوڕی:

"ئەز نە هندێ دلڕەقم زارۆکان بقوتم، لێ تە درەو کرن، پێدڤیە تو شەرم ژ خوە بکەی، تو یێ ب بەخت بووی چونکی بابێ تە ل ڤێرێ نینە، ژبەرکو هەکە ئەو نوکە ل ڤێرێ یێ ئامادە بایە دا تە گەلەك قوتیت."

پشتی هینگێ مەلا پیچەك بێدەنگ بوو و ب دەنگەکێ هێدی پرسیار ژ کوڕکی کرەڤە:

"تە بۆچی بەر هاڤێتە مورتەزای؟"

دیسان کوڕی بەرسڤا وی دا و گوت:

"من ب تنێ وەنەکربوو، بەلکو هندەکێن دی ژی دگەل من بەر هاڤێتن، عەلی و ڕەحیمی ژی بەر د مورتەزای وەرکرن."

جارەکا دی مەلا تۆڕەبوو و شەقەکا دی یا حێل دانا ڕوویێ وی و ئەڤ جارە پتر خوین ژ دەڤ و لێڤێن وی هات.

دگەل ڤێ شەقێ، کوڕکی کرە گری و گوت:

"هیڤی دکەم من بەس بقوتە، بەلێ ئەو ئەز بووم من بەر هاڤێتیە مورتەزای، هیڤی دکەم ل من ببورە."

پشتی هینگێ ئەو زارۆك ژناڤ خەلکی هاتە دەرێخستن و کرە د گۆڤەکا پەزی ڤە.

ل ڤی دەمی کو موختار یێ بێدەنگ بوو و تەماشەی ڤان ڕوودانان دکر، بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە و گوت:

"مە هەموویان پێکڤە بڕیاردا، ئەڤرۆکە بەری ڕۆژ ئاڤا ببیت سوڕەیا مانوچەهری بهێتە ڕەجماندن هەتا دمریت."

ڤێ ئاخفتنێ کەیفا خەلکی گەلەك ئینا و هەر زوو وان دەست هەوارکرن و گازیێن بلند کر:

"مرن بۆ لەشفرۆشێ بیت، مرن بۆ وێ بیت."

دیسان موختاری گوت:

"پێدڤی ب قەڕەبالغ و ڤێژیان ناکەت، هەموو تشت ل دووڤ یاسایێ دێ ب ڕێڤە چن، هەروەسا ل دووڤ وان تشتێن قورئانێ گوتین و بووینە یاسا ئەم دێ سزایێ وێ بجهئینین، چونکی خودایێ مەزن یا ل سەر مە پێدڤی کری ئەم دادپەروەریێ بجهبینین. ڤێ ژنێ شەڕەفا مە هەموویان یا پیسکری لەوڕا نوکە ئەم دێ شەڕەفا خوە پاقژ کەین."

- "ڕەجماندن، ڕەجماندن، ڕەجماندن، نوکە دێ وێ ڕەجمینین."

موختاری دیسان ڤیا وان بێدەنگ بکەت و گوتێ:

"هەڤالێن من، هیڤی دکەم گوهێ خوە باش بدەنە من و چ کاران بێ دەستوورییا من نەکەن ژبەرکو گەڕا هەوە هەموویان دێ هێت، لێ دڤێت ئەم هەموو تشتان ل دووڤ حەزکرنا خودایی و ل دووڤ ڕاسپاردەیێن ئیمامێ مە بکەین."

موختاری بەرچاڤکا خوە ژ بەر چاڤێن خوە کر و کرە د بەریکا خوە دا و گوت:

"ل گوندێ مە چ جاران چ ژن نەهاتینە ڕەجماندن چونکی خەلکێ مە ب بەختەوەری و سەرفەرازی دژیا، لێ ئەز دزانم پارسال ژنەك ل گوندێ "خەواجە" هاتبوو ڕەجماندن کو نە گەلەك یێ ژ ڤێرێ دوورە، سالا بەری هینگێ ژی ژنەکا دی ل باژێرێ "شەهر بابك" هاتبوو ڕەجماندن. هەڤالەکێ من ل باژێرێ کرمان بۆ من شرۆڤەکربوو کا چەوا ژن دهێنە ڕەجماندن و ئەم ژی دێ ل دووڤ ڕێکا وان چین.

زەلامەکی ل ڕێزا پێشییێ گوت:

"باشە نوکە ئەم ژی دا ب ڤی کاری ڕابین."

یەکی دی ژی گوت:

"ئەو ژ هەژی هندێ یە، دا نوکە دەست پێ بکەین."

موختاری گوت:

"نەخێر نوکە ئەم دەست پێ ناکەین بەلکو پشتی دەمژمێرەکا دی ل گۆڕەپانا باژێری دێ ڤێ چەندێ ئەنجامدەین داکو دەلیڤە هەبیت هەموو خەلکێ گوندی ئامادە ببیت، نوکە ل سەر من یا پێدڤیە ئەز بچمە دەڤ سوڕەیایێ داکو ڤی سزای بۆ وێ بخوینم."

زەلامەکێ ب چاڤەکی دناڤ خەلکی دا کو وی ژی هندەك بەر ب دەستێ خوە هەلگرتبوون، گوت:

" پێدڤی ڤێ چەندێ ناکەت، نوکە بلا بچن وێ بینن داکو ئەم دەست پێ بکەین، نابیت ئەم دەمێ خوە ب هەروە ببەین، ئەز نوکە یێ

ئامادەمە یەکەم بەر بدانمە وێ و وێ بکوژم هەروەکی کا چەوا ئەز ب بەرەکی ب تنێ کێڤریشکان دکوژم."

موختاری بەرسڤا وی دا و گوت:

"ڤی کاری دێ هۆسا ئەنجامدەین هەروەکی من بەری نوکە بۆ هەوە شرۆڤە کری، ئەو ژی کا چەوا خودایی فەرمان ل مە کریە و ل دووڤ ڕاسپاردەیێن ئیمامێ مە و ل دووڤ حەزا مورتەزاییێ ڕەمەزانی، نوکە هەڕنە مالێن خوە و پشتی دەمژمێرەکا دی ل گۆڕەپانا گوندی خڕڤەببن، من نەڤێت کەس ژ هەوە بەری ژڤانێ دەستنیشانکری ل وێرێ یێ ئامادە بیت."

هێدی هێدی خەلك ژ وێرێ چوون، زەلام چوونە سەر کارێن خوە و ژن ژی چوونە د مالێن خوە ڤە و زارۆك ژی چوونە ناڤ باخچەیی و یاری کرن.

حەجی ئیبراهیم و مەلا حەسەن چوونە دەڤ سوڕەیایێ داکو بێژنێ کو ئەو پشتی ماوەیەکێ دی دێ هێتە ڕەجماندن و گەلەك ژ ژیێ وێ نەمایە. خەلکێ گوندی هەموویان ئەڤ دەنگوباسە زانی ب تنێ ئەو ژن نەبن یێن ل مالا زەهرایێ و زێرەڤانیا وێ د کری.

ئەو بۆ جارا یەکێ بوو د دیرۆکا گوندێ کوبایێ دا موختار سزایەکێ ب ڤی ڕەنگی بجهبینیت، هەرچەندە وی هەست ب شانازیێ دکر، لێ د هەمان دەم دا نەیێ ئارام ژی بوو، وی دزانی کو دادگەهێن باژێری ب هزاران پشتەڤانێن شاهی یێن سێدارە داین و وی ڕۆژانە دوو جاران گوهێ

خوە ددا ڕادیوییێ داکو ناڤێن وان کەسان بزانیت یێن گونەهـ د دەرحەقا خودایی و ئیمامی دا کرین.

دادگەهێن باژێرێ کرمانێ ب درێژاهیا هەر شەش سالێن بوری یێن پشتی شوڕەشێ بەردەوام کارێ خوە دکر، لێ وی قەت گوهلێنەببوو کو ڤان دادگەهان ڕۆژەکێ سزایێ ڕەجماندنێ ل سەر کەسەکێ سەپاندبیت یان بجهئینابیت.

# بەشێ شەشێ

دەمژمێرەك بوری ل سەر دەرکەفتنا زەلامان ژ بارەگایێ باژێرڤانیا گوندێ کوبایێ ژ بۆ ڕاگەهاندنا سزایێ ڕەجماندنێ ل سەر سوڕەیایێ.

ل بەر دەرگەهێ مالا زەهرایێ، بێدەنگیێ خوە ب سەر هەموو تشان دادابوو، هێدی هێدی ڕۆژ بەرەڤ ئاڤابوونێ دچوو و پلا گەرماتیێ ژی دهاتە خوارێ، بایەکێ هین و فێنك پەیدابوو.

ل ژوورا پێشیێ یا مالا زەهرایێ، دەنگێ کۆمەکا ژنان بەردەوام یێ بلند بوو ب تایبەت ئەوێن قورئان دخواندی و دوعا دکرین و هندەکێن دی ل دووڤ وان ڕا دڤەگێڕان.

ل ژوورا نڤستنێ کو دکەفتە پاشیا خانی، زەهرا بەرەڤ خوارزایا خوە ڤە چوو و گوتێ:

"خۆشتڤیا من سوڕەیا، باش بزانە ئەز پشتا تە بەرنادەم خوە هەکە چ چێ بیت، هەروەسا ئەز دێ هەر حەز ژ تە کەم خوە هەکە چ چێ ببیت، لێ ما ژ ڤێ زێدەتر ئەز دێ بۆ تە چ کەم؟ ئەڤ یاسایە زەلامان دانایینە و پاشی دبێژن ئەڤ یاسایە یێ ژ دەڤ خودایی هاتین. وان تو ب هندێ یا تاوانبار کری کو تو کەسەکا گونەهکاری و د ڕاستی دا تو یا هۆسا نینی، هەروەسا وان سزایەك ل سەر تە یێ سەپاندی و تو کەسەکا بێ

گونەهی. کەس نەشێت ڤێ بێگونەهیا تە بۆ وان بسەلمینیت، نە ئەز و نە تو و نە ئەو ژنێن باش یێن د ژوورا دی ڤە دکەنە گری."

بۆ جارا یەکی سۆرەیایێ زانی کو ئەو بێدەنگیا د ماوەیێ چەندین هەیڤێن بوری دا وێ هەلبژارتی د بەرژەوەندیا وێ دا نەبوو، ژ نیشکەکێ ڤە بۆ وێ حەز چێبوو هەموو ئەو تشتێن د دلێ خوە دا هەلگرتین ئاشکەرا بکەت و هەلویستێ خوە بۆ هەموویان بەرچاڤ بکەت و پشتا خوە بگریت و بێگونەهیا خوە ل بەرامبەری خودایی دیاربکەت، لێ مخابن نوکە دەم یێ ب سەرڤەچووی و کەس ژ نوو باوەر ژێ ناکەت ب تایبەت ئەوێن ئەو تاوانبارکری و سزا ل سەر وێ سەپاندی. لێ هەتا نوکە ژی سورەیا نەشێت باوەر بکەت کو ئەو پیلانا دژی وێ هاتیە گێڕان هۆسا ب سانەهی سەرکەفت و دێ بیتە ئەگەرێ مرنا وێ.

ل وی دەمی، سورەیایێ زانی کو ئێدی هەموو تشت ژ دەستێن وێ چوون، لەورا بڕیاردا هندی تشتەك د مەژی و دلێ وێ دا هەی بۆ خالەتا خوە بێژیت، وێ گوت:

"خالەتا من زەهرا، ئەز ژ مرنێ ناترسم چونکی ئەڤە ژ هینگێ وەرە ئەز مریم دەمێ دایکا من وەغەرکری، دەمێ عەلی سڤکاتی ب من کری و ئەز دقوتایم، ئەڤە ژ هینگێ وەرە دەمێ عەلی ئەز هێلایم و چووی ل دەڤ هندەك ژنێن دی نڤستی."

ل ڤێرێ ئەو ئێدی نەشیا بەردەوامیێ بدەتە ئاخفتنێن خوە و پاشی دەست ب گریەکا حێل کر و هێز د لەشێ وێ دا نەما و کەفتە سەر

چۆکێن خوە.  خالەتا وێ ئەو گرت و سەرێ وێ دانا سەر پێن خوە و ب ڕوویێ وێ ڤە ماچی کر و گوت:

"کچا من، کچا من یا هەژار، ژ گرییێ شەرم نەکە، هندی تە دڤێت بکە گری، ل ڤێرێ کەسێ گوهـ ل دەنگێ گریا تە نابیت و کەس تە نابینیت ژی، کا چ د دلێ تە دا هەیە بێژە و تێر بکە گری."

ل ژوورا ب ڕەخ ڤە دەنگێ ژنان هەر بلند دبوو و دگوت:

"یا خودا، خودایێ مە یێ دلۆڤان، یا موحەمەد، پێغەمبەرێ مە یێ خۆشتڤی".

پاشی سوڕەیایێ گوت:

"خالەت، من نەڤێت ئەز تە بهێلم، من نەڤێت زارۆکێن خوە بهێلم ب تایبەت کچا خوە یا بچووك "خۆچستە"یێ ئەوا هێشتا ژییێ وێ نەبوویە حەفت سال، من نەڤێت ئەز ڤێ ژیانێ ب ڤی ڕەنگی بهێلم، لێ دگەل هندێ ژی ئەز ناترسم چونکی ئەز دزانم دێ چمە وی جهی یێ دایکا من چوویێ و دێ وێ ل وێرێ بینم، ئەز گەلەك یا ژێ خەریب بویم. خالەت تو ب خودایێ مەزن کە چاڤێ خوە بدە زارۆکێن من ب تایبەت کچا من یا بچووك چونکی ئەو هێشتا زارۆکە و ساخلەمیا وێ نە هندا باشە."

دووبارە سوڕەیایێ دەست ب گرییێ کر و پەیڤێن وێ د حەفکا وێ ڕا مانە ئاسێ، پاشی ب لەز بێهنا خوە هەلکێشا و گوت:

"خالەت، سوزێ بدە من ڕۆژەکێ تو بەحسێ ڕاستیا من بۆ وان بکەی دەمێ ئەو مەزن دبن، بێژە وان کا چەوا بێ بەختی ل من هاتیە

کرن و ئەز یا بێگونەهـ بووم داکو ئەو ژ دایکا خوە شەرم نەکەن، سوزێ بدە من تو ڤێ چەندێ بکەی."

خالەتا وێ گەلەك ب ڤان پەیڤێن وێ خەمگین بوو و پاشی گوتێ:

"کچا من سوڕەیا، زارۆکێن تە ب تایبەت کچا تە یا بچووك دێ دگەل من ژین و ئەز دێ هەموو بزاڤان کەم ب جوانترین شێوە وان پەروەردە بکەم و نەهێلم چ تشت یێ ژێ کێم بیت، ئەو ژی زارۆکێن منن و ناهێلم کەس وان ژ من بستینیت، مالا من دێ بیتە مالا وان."

ژ ئاخفتنێن زەهرایێ یا دیار بوو، دەمێ وێ ئەڤ ئاخفتنە دگوتنە خوارزایا خوە. ئەڤ سوزا وێ دای ژ هەردوو کوڕێن وێ یێن مەزن ناگریت چونکی ئەو هەردوو ل شوون پێنگاڤێن بابێ خوە دچوون و چ جوداهی دناڤبەرا وان و بابێ وان دا نەبوو.

کوڕێ مەزن کو ناڤێ وی حسێن بوو، دانەیەکا دەقاودەق یا بابێ خوە بوو. وی ژی دێمەکێ چوارگۆشە و دوو چاڤێن کوور و هندەك ڕیه و سمبێلێن نەتەمام هەبوون، هەروەسا ستۆیێ وی ژی یێ ب هێز بوو کو بۆ گەنجەکێ د ژیێ وی دا جهێ بالکێشانێ بوو. وی خواندن ژی نەبرە سەری و ب تنێ بۆ ماوەیێ سێ سالان چووبوو قوتابخانێ چونکی هەموو گاڤان شەڕێ هەڤالێن خوە دکر و ژ قۆتابخانەیێ دەرڤی.

هێشتا ئەو یێ بچووك، نیشانێن زارۆکەکێ هار و شیم ل دەڤ وی پەیدابوون، وی پەنجەرکێن خەلکی دشکاندن و دزی ژ هەڤالێن خوە یان مالێن گوندیان دکرن، گەلەك جاران وی مریشك و کێڤریشکێن گوندیان ددزین و دچوو سەرێ چیایی و ئاگر ل وێرێ هەلدکر و دقەلاندن.

هەروەسا هەڤالێن وی ژی هەر زوو خوە ژێ دوورکر چونکی شەڕێ وان دکر و ئەو دقوتان.

ل دەستپێکێ بابێ وێ سەرا ڤی ڕەوشتێ وی یێ کرێت ئەو سزا ددا و هندەك جاران ئەو دقوتا ژی، هەتا کو شوونوارێن برینەکا کرێت ل پشتا گوهێ وی یێ ڕاستێ مابوون دەمێ جارەکێ بابێ وی ئەو گەلەك قوتایی. لێ چەند جارەکا بابێ وی ئەو قوتابا دا چیت وی کارێ خڕاب دووبارە کەتەڤە ژبەرکو ئەو زارۆکەکێ زێدە خڕاب و ڕکو و سەر ڕەق بوو. وی هەموو دەمێ خوە دناڤ دارستان و ڕەز و بیستانێن گوندی دا دبوراند ب تنێ بۆ خوارنێ و نڤستنێ دهاتە مال.

برایێ وی یێ بچووکتر کو دوو سالان ژ وی بچووکتر بوو و ناڤێ وی حەسەن بوو، ب چ ڕەنگان وەکی برایێ خوە یێ مەزن نەبوو، بەلکو دێمەکێ پاقژ و سپی و جوان هەبوو، ل قوتابخانەیێ ژی زارۆکەکێ زیرەك و گوهداربوو، وی هەموو گاڤان هاریکارییا خەلکی دکر، هەروەسا وی هاریکارییا بابێ خوە و هەڤسوییێن خوە دکر ب تایبەت دەمێ کێشانا ئاڤێ و هەلگرتنا سندۆقێن فێقی و ئاڤدانا گیانەوەران و دۆشینا شیری ژ چێلان.

لێ دەمێ دەرگەهێن قوتابخانەیان دهاتنە گرتن، ئەو نەچار دبوو دگەل برایێ خوە یێ مەزن بمینیت و تا ڕادەیەکی بکەڤیتە ژێر کاریگەرییا کارێن وی یێن خڕاب، هەرچەندە وی ب خوە دزی نەدکرن لێ بێدەنگ بوونا وی ل سەر دزیێن برایێ وی دبوو ئەگەر ئەو ژی ببیتە هەڤپشکێ وی.

ئەڤ هەردوو زارۆکە مەندەهۆش نەمان دەمێ داخواز ژێ هاتیە کرن ئەو ژی ل ڕۆژا دادگەهکرنا دایکا خوە ل سەر دەستێ بابێ خوە ئامادە ببن، بۆ وان ئەڤ چەندە کارەکێ زێدە سروشتی بوو. وان هەردووکان ژی وەکی هەموو زەلامێن دی یێن ئامادە دەستێ خوە بلند کر دەمێ پرسیار هاتیە کرن کا ئەرێ سوڕەیا یا گونەهکارە یان نە.

ژ لایەکێ دی ڤە زەهرا ب ڕەخ خوارزایا خوە ڤە ڕووشنتە خوارێ کو ل وی دەمی ژنەکا دانعەمر بوو و پشتا وێ پیچەکێ خوار بوو. وێ دەڤێ خوە هێدی هێدی د لڤلڤاند و هندەك پەیڤ دگوتن لێ کەسێ گوهـ ل ئاخفتنێن وێ نەدبوو. وی ب دێمەکێ خەمگین ڤە تەماشەی سوڕەیایێ دکر، لێ وێ ژ نیشکەکێ ڤە دیت سوڕەیایێ ئاگەهـ ژ خوە نەمایە.

– سوڕەیا... سوڕەیا... سوڕەیا... تە گوهـ ل من هەیە؟

سوڕەیایێ بەرسڤا وێ نەدا، بەلکو ئاگەهـ ژ خوە نەبوو و چووبوو جیهانەکا دی.

دووبارە زەهرایێ پرسیار ژێ کر:

"کچا من سوڕەیا، کا هشیاربە، تە گوهـ ل من هەیە؟"

سوڕەیایێ ب دێمەکێ شکەستی و بێ لڤین تەماشەی وێ کر.

زەهرایێ دەستێ خوە دانا بن سەرێ وێ و دانا سەر پێن خوە و گوتێ:

"بەرسڤا من بدە، تە گوهـ ل من هەیە؟"

سوڕەیایێ چاڤێن خوە گرتن و ڕۆندك ژ چاڤێن وێ هاتنە خوارێ.

پاشی زەهرایێ ئەو دا بەر سینگێ خوە و هەمبێز کر، ب ڤێ چەندێ وێ هەموو ئەو یاسا و دابونەریت شکاندن یێن ل ناڤ جڤاکێ وێ هەین کو نابیت ب چ ڕەنگان کەسەك دەستێ خوە بکەتە تاوانبارەکی یان بدەتە بەر سینگێ خوە. خوە هەکە تاوانا وی چەند یا بچووك ژی بیت.

سوڕەیایێ گوت:

"خالەت، من دایکا خوە ددیت ئەو ل بن دارەکێ یا ڕوونشتی بوو، وێ دەستێ خوە بۆ من درێژکر و دگرنژی و دگوتە من:"

و ل دوماهیێ تو هاتیە دەڤ من، ئەز گەلەك ل هیڤیا تە مام هەتا تو هاتیە دەڤ من."

پاشی سوڕەیایێ دەست ب گریەکا حێل کر هەتا دەنگێ وێ گەهشتیە گوهێن ژنێن ژوورا دی و هەموویان دەست ژ کرنا زکری و دوعایان بەردا. پاشی دوو ژنان پەنجەرك قوتا و گوت:

"خانم زەهرا، نوکە دەم هات، حەجی ئیبراهیمی داخواز ژ مە کر ئەم ڤێ پەیامێ بگەهینینە هەوە داکو نوکە هوون دگەل مە بهێن."

ل دەستپێکێ زەهرا ڕابووڤە و پاشی هاریکارییا سوڕەیایێ کر هەتا ئەو ژی ڕابوویەڤە و ل بەر دەرگەهێ ژوورا دی پێنج ژنێن دی یێن خوە ب جلێن ڕەش نخافتی هاتنە دگەل وان، پاشی دووبارە پەنجەرك هاتە قوتان و ئەڤ جارە ب ئاوایەکێ رۆهنتر و دیارتر گوت:

— خانم زەهرا، تە گوهـ ل مە هەیە، نوکە دەم هات و خەلك هەموو یێ چاڤەڕێ یە.

زەهرایێ دەستێ خوارزایا خوە گرت و بەرەڤ دەرگەهی چوون و ژنێن دی ژی دا ب دووڤ وان ڤە. ل وی دەمی چاڤێ وان ب هەردوو ژنێن بەر دەرگەهی کەفت.

زەهرا چوو بن گوهێ سورەیایێ و گوتێ:

"کچا من قەت خوە نەترسینە و یا وێرەك و ئازابە، تو مرۆڤەکا بێگونەهی و خودا ژی ڤێ چەندێ باش دزانیت، ڤێجا قەت خوە نەترسینە."

زەهرایێ هێدی دەستێ خوە هاڤێتە دەستکێ دەرگەهی و ڤەکر، دەمێ وێ دەرگەهـ ڤەکری، بایەکێ گەرم خوە ل ناڤچاڤێن وێ دا، زەهرایێ عەبایەکێ ڕەش کربوو بەر خوە و لەشێ خوە هەموو ڤەشارتبوو ب تنێ دێمێ وێ یێ پڕی هێلێن قۆرمچی و ناڤ چاڤ گرێ د دیار بوون، ژبەر ڤێ چەندێ ئەو وەکی پیرەژنەکا سێربەند و ب ترس خۆیا دکر.

دەمێ ئەو هاتیە ژ دەرڤە، هەر یەکسەر نێزیکی پێنجی کەس ل دەروبەری مالا وێ خڕڤە ببوون.

پشتی هینگێ دا بێژی دەرگەهێ دۆزەخێ هاتە ڤەکرن، دەمێ سورەیا ل پشت زەهرایێ دەرکەفتی کو وێ ژی عەبایەکێ ڕەش دانابوو سەر سەرێ خوە و دێمێ خوە هەموو ڤەشارتبوو، خەلکی کرە هەوار و ڤێژی ڤەدان و پاشی هەر حەفت ژنێن دی ژی ل دووڤ وان چوون کو شەش ژ وان دێمێن خوە دیارکربوون ب تنێ یەك تێ نەبیت ئەو ژی ل دووڤ ڕاسپاردەیا موختارێ گوندی.

دەنگێ خەلکی هێدی هێدی بلندتر لێ دهات، موختار ژی دگەل وان بوو دگوتێ:

"پیچەکێ بێهنا خوە فرەهـ کەن، ئاها نوکە دەم هات ئەم سزایێ وێ بجهبینین."

خەلك یێ بەردەوام بوو ل سەر ئاخفتن و ڤێژی یێن خوە. پاشی دەنگێ کەسەکی بلند بوو و گوت:

"هەر نوکە، هەر نوکە دا وێ سزا بدەین."

پاشی دەنگێ یەکێ دی ژی هات و دڤیا بەرسڤا وی بدەت و گوت:

"بەلێ هەر نوکە، ئەم زێدەتر بێهنا خوە ل سەر وێ فرەهـ ناکەین."

کەسەکێ دی ژی دڤیا خوە بینتە پێش و گوت:

"ئەڤی بابەتی گەلەك ڤەکێشا، پێدڤیە ئەم نوکە پێ ڕابین و ڤی کاری ب دوماهی بینین و ل ڤێرێ وێ بڕەجمینین."

حەجی ئیبراهیمی دەستێ خوە بلند کر و گوت:

"ئەڤرۆکە ڕۆژەکا درێژ و ب زەحمەت بوو بۆ مە، لێ هێشتا کارێ مە ب دوماهی نەهاتیە، لێ هەر وەکی من گوتیە هەوە، دڤێت ئەم هەموو تشتان ل دووڤ یاسایێ بڕێڤە ببەین و نوکە مەلا حەسەن یێ ب ڕەخ من ڤە و وی بەرهەڤیێن ڤی کاری هەموو یێن کرین و ل دووڤ یاسایێ و شەریعەتێ خودایی ئەم دێ ڤی کاری بڕێڤە بەین."

پاشی بەرەڤ زەهرایێ ڤە چوو و ب دەنگەکێ وەکی یێ شانۆگەڕیان گوتێ:

"هیڤی دکەم گونەهبارێ نێزیکی مە بکەن."

زەهرایێ چ پووتە ب ئاخفتنا وی نەکر و پاشی ل سوڕەیایێ زڤڕی و گوتێ:

"خوە ب هێز بێخە و بلا بەرێ تە ل پێشیێ بیت، سەرێ خوە بلند بکە و شەرم نەکە چونکی تو ژنەکا بێگونەهی."

پاشی وان بەردەوامی دا سەر چوونا خوە و خەلکی ڕێك بۆ وان و ژنێن دگەل دا ڤەکر.

لێ هەر زوو خەلکی دەست ب گوتنا ئاخفتن و گوتنێن کرێت و نەجوان کرن و ئاخفتنێن نەجوان گوتنە سوڕەیایێ و هندەك تەپ و پێهن ددانانێ و هندەکێن دی تشت تێوەر دکرن، هەموو ئەو ژنێن دگەل سوڕەیایێ ژی ژ ڤان شەق و پێهنا بێ بەهر نەبوون ب تنێ خالەتا وێ نەبیت.

موختاری ئەڤ تشتە هەموو ب چاڤێن خوە ددیتن لێ وی ئەو وێرەکی نەبوو بێژیتە خەلکی وەنەکەن، ژبەرکو ئەڤە ژ سپێدێ وەرە خەلك گەلەك یێ تۆڕە و بێزار بووی و مافێ وانە ب ڤی ڕەنگی دەربڕینێ ژ تۆڕەبوونا خوە بکەن.

پاشی ژ نیشکەکێ ڤە یەکی شەقەك ل پاتکا زەهرایێ دا، یەکسەر ئەو ڕاوەستیا و سەرێ خوە بلند کر دا بزانیت کا ئەو کی بوو شەق دانایە

وێ. پشتی وێ ئەو کەس نیاسی، هندەك ئاخفتنێن کرێت گوتنێ و هندی ژ وێ هاتی شەقەکا حێل ل ڕوویێ وی دا.

خەلکی هەموویان ب دەنگەکێ بلند پێ کرە کەنی، پشی هینگێ خەلك پیچەکێ بێدەنگ بوو هەتا هەموو ژن گەهشتینە نیڤا گوڕەپانا گوندی، سوڕەیا ل پشت خالەتا خوە دچوو و گەلەك خوە نێزیکی وێ دکر خوە دا بێژی ئەڤە دوو ژن لەشێ وان یێ مایە پێکڤە. لێ ئەو ژنێن دگەل وان، پیچەکێ خوە ژێ دا پاش و بەردەوام بوون ل سەر کرنا دوعایان.

— یا خودایێ مەزن، خودایێ ئەرد و ئاسمانان، گونەهێن مە ژێببە و ل مە ببورە.

پاشی موختاری و مەلای خوە نێزیکی وان کر و خەلك هەموو ب بازنەیی ل دورماندوری وان خڕڤەبوون و هەر یەکی بزاڤ دکر خوە بگەهینتە ڕێزا پێشیێ داکو ڕوودانێن ڕەجماندنێ ب چاڤێن خوە ببینن.

موختاری داخواز ژ وان هەر پێنج ژنان کر خوە بێدەنگ بکەن و بچنە پشت زەلامان ڕاوەستن داکو سوڕەیا ب تنێ بمینتە ل بەر سینگێ وان زەلامێن دێ سزایی ل سەر وێ بجهـئینن.

ئەڤرۆکە، موختارێ گوندی نە وەکی چ ڕۆژێن دی بوو، ژبەرکو ئەڤە یەکەم ڕۆژە ئەو هۆسا ژ دل کارەکی ئەنجامدەت و هەست ب واستیانێ ناکەت، تا وی ڕادەی ئەڤرۆکە وی گوپالێ خوە ژی یێ هاڤێتی و بەرچاڤکا خوە یا کریە د بەریکا خوە دا.

ژ لایەکێ دی ڤە، مەلا حەسەنی دڤیا خوە ب ئاوایەکێ جوان و ماقیل بۆ ڤێ هەلکەفتێ بخەملینیت، بەری ڕێوڕەسمێن سزادانێ دەست پێ بکەن ئەو چوو سەرتڕاشخانێ داکو ڕیهـ و پرچا خوە چێکەت.

بابێ سوڕەیایێ، مورتەزایێ ڕەمەزانی، ل لایەکی یێ ڕاوەستیایی بوو چ نیشانێن پەشیمانییێ ل سەر دێمێ وی د دیار نەبوون، لێ جلێن وی یێن بێ سەروبەر وەکی هەرجار د پیس و کەڤن بوون.

جارەکا دی خەلکی دەست ب هەوارکرنێ کر و گوتنێ:

"وێ بکوژن، وێ بڕەجمینن."

ل ڤێرێ موختاری بزاڤ نەکر وان ب ڕاوەستینیت یان بێدەنگ بکەت چونکی گاڤ بۆ گاڤێ خەلك تۆڕەتر لێ دهات، موختاری هزرکر ئەڤ تۆڕەبوونا خەلکی دێ بیتە ئەگەر ئەو ب باشترین شێوە سزایێ ڕەجماندنێ بجهبینن.

موختاری دڤیا ڕوودانێن ڕەجماندنا سوڕەیایێ هەتا هەتایێ بمینتە د مەژیێ خەلکێ گوندی دا، هەروەسا وی دڤیا دەنگوباسێ ڤێ ڕوودانێ بگەهیتە هەموو دەڤەر و گوندێن دەوروبەر، هەتا بگەهیتە پایتەختی ژی. وی د دلێ خوە دا دگوت:

"ئەرێ دێ چ چێ بیت ئەگەر ئەڤ دەنگوباسە بگەهیتە گوهێن ئیمام خومەینی؟ دێ چەند کەیفا وی هێت دەمێ ئەو دزانیت مە ئەڤ کارە ب ناڤێ وی یێ کری؟ مانە ئەڤە بۆ وی جهێ سەربلندییێ یە؟

ژبەر ڤێ چەندێ موختاری بزاڤ دکر هەموو تشت ب جوانی و ڕێکوپێکی و ل دووڤ یاسایێ بهێنە برێڤەبرن.

موختاری گوت:

"سوڕەیا مانوچەهری، پشتی ڤەکۆلینەکا ڕاست و دروست و دادپەروەر، ئەم گەهشتینە بڕیارەکێ، ئەو ژی تو دزانی کا دێ سزایێ تە چ بیت."

خەلکی گوت:

"ڕەجماندن، ڕەجماندن، ڕەجماندن."

موختاری گوتێ:

"ها تە گوهلێبوو وان چ گوت، دادپەروەریا گوندێ مە گەهشتە وێ باوەریێ کو دڤێت تو بهێتە ڕەجماندن."

– "نوکە، نوکە، هەر نوکە دێ وێ ڕەجمینین."

هۆسا یا دیار بوو کو خەلکێ گوندی باش خوە بۆ ڤێ ڕوودانێ یا ئامادەکری ژبەرکو هەموویان بەر ب دەستێن خوە هەلگرتبوون و هندەکێن دی هەر تشتەکێ کەفتیە بەر دەستێن وان یێن دگەل خوە ئینایین داکو وێ ژنێ پێ بڕەجمینن، موختاری دیت خەلك گەلەك یێ تۆڕە و ب لەزە بۆ ئەنجامدانا ڤی کاری، لەوڕا وی هزرکر هندی ئەو لەزێ د ڤی کاری دا بکەت باشترە نەکو کونترۆل ژ دەستێن وی دەرکەڤیت.

پاشی موختاری ئاماژە دا هەڤالێ خوە مەلا حەسەنی داکو ئەو پیچەکێ بۆ خەلکی باخڤیت و وان بێدەنگ بکەت، ژبەرکو خەلکی ڕێزەکا مەزن ل مەلای دگرت.

مەلای گوت:

"هەڤالێن من یێن خۆشتڤی، ئەز بۆ ماوەیەکێ درێژ نینە ل ڤی گوندی دژیم، لێ هۆسا دیارە خودایێ مەزن ئەز یێ هنارتیم داکو دناڤ هەوە دا بژیم و من بڕیارا دای ئەز گوندێ کوبایێ بجهـ نەهێلم ژبەرکو بۆ من وەکی بەهەشتێ یە ل سەر ئەردی و ژیانا خوە یا مایی هەموویێ ژی دێ د خزمەتکرنا هەوە دا بورینم."

کەیفا خەلکی گەلەك ب ڤان گوتنێن وی هات و هەر یەکسەر هەموویان دەست بۆ قوتان و دەستخۆشی لێکر و سوپاسیا هەلویستێ وی کر.

ژ لایەکێ دی ڤە، ئەڤ خەلکێ گوندی ب ئاوایەکێ هۆسا بەرهەڤی ڤێ ڕوودانێ ببوون، دا بێژی ئیمام خومەینی یان بەرپرسەکێ دی یێ وەلاتی ژ پایتەختی یێ هاتی و ل گوندێ وان بوویە مێهڤان، یان ژی دا بێژی ئەو یێن چووینە پێش شانۆگەریەکێ یان فلمەکێ سینەمایی.

مەلای دەستێ خوە درێژ کرە سوڕەیایێ و گوت:

"ڤێ ژنێ نامیسا گوندێ مە یا پیسکری، دڤێت ئەم جارەکا دی نامیسا خوە بزڤڕینن، هوون ئەی خەلکێ گوندی، هوون ب دەستێ خوە دێ ڤی کاری کەن و نامیسا گوندێ خوە پاقژ کەن داکو کەسێ دی چاڤ ل وێ نەکەت."

– ڕەجماندن, ڕەجماندن.

مەلای داخواز ژ وان کر هەر یەك بچیت هندەك بەران کۆم بکەت، وی ئەو پشتڕاست کرن کو سزایێ ڕەجماندنێ ب ڕێڤە ناچیت هەتا هەموو بەران نەئینن و ل وێرێ ئامادە نەبن.

پاشی ب دەهان زەلامێن گوندی چوون بەران خرڤە بکەن و هندەکێن دی چوون داکو هندەك ئامیرەیێن کۆلانا ئەردی وەك مەربێلك و قەزمە و تشتێن دی یێن پێدڤی بینن. هندەك چوونە سەر ڕووباری داکو بەرێن مەزن ژ وێرێ بینن و هندەکێن دی چوونە سەر وان خانییێن کەڤن و هەڕفتی و بەر ژ وێرێ ئینان.

پشتی بورینا دەهـ خۆلەکان، خەلك جارەکا دی ل دورماندوری وان خڕبوونەڤە و هەر یەکی کۆمەکا بەران کریە د دەستێ خوە دا، ل ڕێزا پێشیێ موختار و مەلا و عەلی و هەردوو کوڕێن وی یێن مەزن و هاریکارێن موختاری د ڕاوەستیایی بوون.

ل پێشیا خەلکی ژی، سوڕەیا یا ڕاوەستیایی بوو چاڤەڕێی چارەنڤیسێ خوە یێ ڕەش دکر، ئەوێ چ تشت نەشێن ببنە ڕێگر ل هەمبەر ڕاوەستنا وی. ئەو یا بێدەنگ بوو و نێزیکی مەترەکێ ژ موختار و مەلا و بابێ خوە یا دوور بوو.

ئاها نوکە ڕێوڕەسێن ڕەجماندنێ دێ دەستپێدکەن.

موختاری پرسیارکر:

"کێ مەربێلەك یان قەزمەیەك دگەل هەیە؟"

موختاری چاڤێ خوه ل خەلکی گێڕا. زەلامەکی دناڤ خەلکی دا ب دەنگەکێ بلند گوت:

"ئەڤە یا دگەل من هەی."

یەکێ دی ژی ژ لایەکێ دی ڤە کرە هەوار و گوت :

"یەك یا دگەل من ژی هەی."

هندەك زەلامێن دی ژی یێن کەلوپەلێن کۆلانێ دگەل هەین خوە نێزیکی موختاری کرن داکو هاریکارییا وی بکەن.

ل دوماهیێ نێزیکی شەش کەسان خوە ئامادەکر داکو ب کارێ کۆلانا چالّەکا ئەردی ڕابن کو ئەو ژی ئەڤەبوون: ڕەسولێ دارتاشێ گوندی، ماجد و موشن کو کوڕێن گوشتفرۆشێ گوندی بوون، ئەسغەر و ڕەحمەتوللاهـ و عەلی ئەکبەر کو ئەو ژی کوڕمامێن عەلی بوون. هەر یەك ژ ڤان زەلامان ب دەستەکی هندەك بەر هەلگرتبوون و ب دەستەکێ دی ئامیرەکێ کۆلانی هەلگرتبوو.

بەری نوکە، هەر یەك ژ ئەسغەر و ڕەحمەتوللاهـ و عەلی ئەکبەر ب کارێن گران و زەحمەت ڕادبوون، بۆ نموونە هەکە جارەکێ ترۆمبێلەکا مەزن هاتبایە گوندی، ئەڤ چەندە ژی کێم جاران ڕوویددا ژبەرکو زوو ب زوو چ ترۆمبێل نەدهاتنە گوندێ وان، ئەو یەکسەر دا چن هاریکارییا خۆدانێ وێ کەن و ئەو بارێ ل سەر پشتا وێ وەك قنینێن غازێ و بەرمیلێن گازێ یان زەیتێ و گینیکێن برنجی یان کیسکێن چیمەنتۆیێ یان هەر تشەکێ دی یێ دگەل هەبایە دا ئیننە خوارێ.

هەروەسا ئەو ب کارێ نووژەنکرنا سکرێ گوندی ڕادبوون دەمێ ژبەر لەهیان یان بارانێن بۆش ژ ناڤ چووبایە، زێدەباری بڕینا داران و دروستکرنا خانیان.

موختاری پرسیار ژ هەر شەش کەسان کر:

"هوون د ئامادەنە وەك خۆبەخش ڤی کاری ئەنجامبدەن؟"

هەموویان پێکڤە بەرسڤا وی دا و گوت:

"بەلێ."

موختاری داخواز ژ دارتاشی و کەسێن دگەل دا کر کەلوپەلێن خوە دگەل خوە بینن و بهێنە دەڤ وی داکو دەست ب کارێ خوە بکەن، خەلکی ژی ڕێکا وان ڤەکر داکو بشێن ژناڤ وێ قەرەبالغێ بهێنە ژ دەرڤە، د ڤی دەمی دا سوڕەیا وەکی پەیکەرەکێ ڕەش و هشك د جهێ خوە دا یا ڕاوەستیایی بوو.

موختاری دەستێ خوە درێژکرە پارچەیەکا ئەردی ل دوماهیا گۆڕەپانێ کو هەموو گاڤان ئەو ترۆمبێلا ژ گوندی دهات ل وی جهی دڕاوەستیا، ئەڤ پارچەیا ئەردی پیچەکێ یا ڕك بوو و هندەك بەر و گژوگیا ل سەر شین ببوو، هەروەسا هندەك کێڤژالێن زیانبەخش ژی ل سەر دنڤستی بوون.

موختاری گوتە ڕەسولی:

"ئاها هەڕە وێرا هە چالەکێ بکۆلە."

ڕەسولی دەست هاڤێتە قەزمێ خوە و تەماشەی خەلکی کر و ب دەنگەکێ بلند گوت:

"ب ناڤێ خودایێ مەزن."

وی هەتا نێزیکی سیهـ جاران مەڕبێلکا خوە ل ئەردی ددا و ئاخ د کۆلا، دگەل هەر جارەکێ ژی ناڤێ خودایی دئینا.

پشتی بورینا دەهـ خۆلەکان، کووراتیا چالێ گەهشتە نیڤ مەترێ، ڕەسولی سەرێ خوە بلند کر و پشتا خوە ڕاست کر داکو پیچەکێ بێهنا خوە ڤەدەت بەری کو جارەکا دی دەست ب کۆلانێ بکەتەڤە، پاشی موختاری گازی کرێ داکو بڕاوەستیت. موختاری گوتێ:

"جارێ نوکە ئەڤە بەسە، دەستێن تە د خۆش بن، نوکە تو بێهنا خوە ڤەدە بلا یەکی دی بچیت تەمام بکەت."

ل دووڤ دا موختاری ئاماژە کرە کوڕێن گوشتفرۆشی و گوتێ:

"کی ژ هەوە دێ چیت چالێ کۆلێت؟"

مۆشنی قەزمە ژ دەستێ برایێ خوە ئینا دەرێ و بەرەڤ چالێ چوو و پاشی گوت:

"سۆپاس بۆ خودایی." و دەست ب کۆلانا چالێ کر.

هێدی هێدی کووراتیا چالێ پتر لێ دهات و ڕەنگێ ئاخا وی ژی تارپتر لێ دهات، پاشی موختاری گوتە مۆشنی جارێ تو ژی بڕاوەستە و قەزمەی بدە ڤ برایێ خوە.

ماجدی قەزمە ژ برایێ خوە وەرگرت و چوو د چالێ دا و دووبارە دەست ب کۆلانا وێ کر هەتا د ماوەیێ بیست خۆلەکان دا کووراتیا وێ گەهشتیە کێمتر ژ مەترەکێ.

پشتی ئەو ژی واستایی، موختاری گوتە ئەسغەری نوکە گەڕا تە هات.

ئەسغەری مەڕبێلك هەلگرت و چوو ئەو ئاخا مایە د چالێ دا هەموو هاڤێتە ژ دەرڤە، پاشی موختاری گازی کرە ڕەسولی داکو جارەکا دی بچیت چالێ ب کۆلیتەڤە و ل دووڤ دا موشن و ماجد ژی چوونە هاری وی.

دەمێ کووراتیا چالێ گەهشتیە مەترەك و چارێکەکێ، مۆشنی پرسیار ژ موختاری کر:

"ئەرێ ئەڤ کووراتیە بەسە؟"

موختاری بەرسڤا وی دا و گوت:

"بلا پیچەکا دی ژی یا کوور بیت، نێزیکی دوازدە هەتا پازدە سانتیمەترێن دی ژی بکۆلە داکو کووراتیا وێ پتر لێ بهێت."

ئەسغەر هات و دووبارە ئاخا دناڤ چالێ دا هاڤێت و پاشی مەڕبێلك دا ڤ ڕەحمەتوللاهی و پشتی وی ژی هندەك ئاخ هاڤێتیە دەرێ، مەڕبێلك دا ڤ عەلی ئەکبەری.

ل دوماهیێ موختار ب وێ کووراتیێ ڕازی بوو و گوتێ:

"نوکە ئەڤ کووراتیە بەسە، کەلوپەلێن خوە بدانە ڕەخەکی و ل دووڤ من وەرن."

موختار و مەلایێ گوندی هاتنە دناڤ خەلکی دا، ل وی دەمی ڕۆژ چووبوو ئاڤا و بایەکێ هین ب سەر گوندی دا هاتبوو خوارێ و خەلك هەموو د بێدەنگ بوون و چاڤێ وان ل موختاری بوو کا دێ چ کەت.

ب درێژاهیا ماوەیێ کۆلانێ، مەلا حەسەن یێ ڕاوەستیایی بوو بێی کو لڤینەکێ بکەت یان ئاخفتنەکێ بێژیت، سورەیا ژی ل بەرامبەری وی یا ڕاوەستیایی بوو ل بن عەبایێ خوە یێ ڕەش ڤە ب ناڤچاڤێن گرێ تەماشەی وی دکر و نەفرەت لێ دباراندن، ژبەرکو وێ هێشتا باوەرنەدکر کا چەوا کەسەکێ سەختەچی ئەڤ چەندە ئینا سەرێ وێ و بوو ئەگەرێ تێبرنا وێ.

هەر ژ وێ ڕۆژا حەسەن هاتیە گوندێ کوبایێ و بزاڤ کری خانییێ ئاغایی بۆ خوە نووژەن بکەت و بچیتە تێڤە، سورەیایێ هەست ب پیلانێن وی کر، گەلەك جاران وی بزاڤ دکر پۆستێ خوە یێ مەلاتییێ بکاربینیت داکو وێ د سەردا ببەت و ببەتە مالا خوە ب تایبەت ل دەمێن پشتی نیڤرۆ دەمێ هەڤژینێ وێ ل باژێری و گوندی ژی هەموو دناڤ ڕەز و بیستانێن خوە دا.

هەردەمێ زانیبا ئەو ب تنێ یا ل مال ژی، دا ب هێجەتەکێ چیتە مالا وێ و بەحسێ ڕۆلێ ژنێ د ئیسلامێ دا و د وەلاتێ ئیرانێ دا بۆ شرۆڤە کەت، لێ دەمێ جارەکێ بێی دەستووری چوویە د مالا وی ڤە، زەهرا ل دووڤ وی چوو و ژ مالا وێ دەرێخست.

نوکە مەلا ژی یێ دناڤ خەلکی دا ڕاوەستیایە و قورئانەك یا د دەستێن وی دا، هەروەسا ئەو ژی ل بن بەرچاڤکا خوە یا ڕەنگ تاری دا تەماشەی سورەیایێ دکەت. وی قەت ئەو ڕۆژ ژبیرنەکربوو دەمێ سورەیایێ

ئەو ڕەتکری و ژ مالا خوە کریە دەرێ، ژبەر هندێ نوکە دەلیڤە بۆ وی هاتیە تۆلێن خوە ژ وێ ڤەکەت.

هەرچەندە ل ڤی دەمی ژیێ سوڕەیایێ نێزیکی سیه‌ و پێنج سالان یان پیچەکێ پتربوو، لێ هێشتا ئەو ژنەکا گەلەك جوان و بالکێش بوو. پشتی مەلای زانی هەڤژینێ وێ ئەو یا هێلای و بڕیار یا دای ژنەکا دی بۆ خوە بینیت، وی ب دەلیڤە دیت ئەو خوە نێزیکی وێ بکەت و وێ ڕازی بکەت شوو پێ بکەت.

ڕەنگە ڕەفتارا سوڕەیایێ بۆ ڕەتکرنا داخوازا مەلای کارەکێ نەبەرهۆش بیت ژبەرکو هەکە ئەو ڕازیبایە، نوکە ئەو نەدکەفتە د ڤێ رەوشێ دا و ئەڤ چەندە هەم نەدهاتە سەرێ وێ، لێ چ پێنەڤێت خالەتا وێ زەهرایێ کارتێکرن ل سەر وێ هەبوو و ڕێگر بوو د ڤێ چەندێ دا.

ل دەستپێکێ هندەك گوتگوتك ل ناڤ گوندی بەلاڤبوون کو مەلای سەرەدەریەکا نەجوان دگەل سوڕەیایێ کریە و ئاخفتنێن کرێت گوتینێ، زەهرا شیا ب ئاوایەکێ باش و د بەرژەوەندیا سوڕەیایێ دا ڤێ گوتگوتکێ دناڤ خەلکی دا بەلاڤ بکەت.

ل چەند ڕۆژێن دەستپێکێ، خەلکی باوەر ژ ئاخفتنێن زەهرایێ دکر و ب چاڤێ گۆمانێ تەماشەی مەلای دکر و خوە ژ ڕەفتارێن وی نەڕازی دکر، لێ هەر زوو عەلی هاتە دناڤ بابەتی دا و ئەڤ گوتگوتکە ب نەوەیی دەرێخستن.

عەلی دگوتە خەلکێ گوندی کو هەڤژینا وی سوڕەیا ژنەکا نەباش و خڕابە و دڤێت ژ ناڤودەنگیا مەلای کێم بکەت و هندەك تومەتا بۆ

دروست بکەت و خڕابیا خوە بکەتە سەر وی، مخابن هەر زوو خەلکێ گوندی ئەڤ ئاخفتنێن عەلی باوەرکرن و دژی سوڕەیایێ ڕاوەستیان، لێ ل ڤێرێ عەلی پێدڤی ب هندەك بەلگەیێن دی بوو داکو هەڤژینا خوە پتر ل پێش چاڤێن خەلکی ڕەش بکەت.

مرنا فەیروزێ و چوونا سوڕەیایێ بۆ مالا هاشمی، باشترین ڕێك بوو کو عەلی و مەلا حەسەن هندەك تومەتا بۆ وێ دروست بکەن و ب یەکجاری خوە ژ وێ قورتال بکەن، وان هەردووکان پێکڤە بەردەوام بۆ ڤێ چەندێ کاردکر هەتا وان سوڕەیا گەهاندیە وێ ڕەوشێ یا نوکە ئەو کەتیە تێدا.

نوکە دەم هات مەلا حەسەن بۆ خەلکی باخڤیت. مەلا چوو سەر پێسترکا گەرۆك یا بۆ وی هاتیە ئامادەکرن و گوت:

"نوکە دەم هات ئەم سوپاسیا خودایێ مەزن بکەین، هەروەسا سۆپاسیا ئیمامێ خوە یێ بەڕێز بکەین."

خەلکی هەموویێ ژی دگەل وی کرە هەوار و سۆپاسیا خودایی و ئیمامی دکر. ل دووڤ دا، وی ئەو دەستێ خوە یێ قورئان تێدا بلندکر و گوت:

"ب ناڤێ خودایێ مەزن و دلۆڤان."

دووبارە خەلکی هەموویێ ژ ژن و زەلامان ئاخفتنا وی دووبارە کر و گوتن: "ب ناڤێ خودایێ مەزن و دلۆڤان."

مەلا حەسەنی و خەلکێ دگەل دا هەموویان ب دەنگەکێ بلند دەست ب خواندنا سۆرەتا فاتیحە کر:

"الحَمدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِينَ، الرَّحمَنِ الرَّحِيمِ، مالكِ يَومِ الدِّينِ، إِيَّاكَ نَعبُدُ وَإِيَّاكَ نَستَعِينُ، اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ، صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ".

هێشتا وان خواندنا ڤێ ئایەتێ ب دوماهی نەئینای، ل وی ئەڤرازیا بنێ گوندی، دەنگێ دوو ترۆمبێلێن نەخشاندی ب ڕەنگێن کەسك و سۆر هاتە گوهێن وان. موختاری سەحکرە مەلای و مەلای سەحکرە عەلی.

عەلی پرسیار کر:

"ئەرێ ئەڤە کینە و ئەو ڤێ ئێڤاریێ هاتینە گوندی چ؟"

هەردوو ترۆمبێل هاتنە نێزیکی وان و ڕاوەستیان، پاشی چوار کەس ژێ هاتنە خوارێ کو هندەك جلێن سەیر و ڕەنگاوڕەنگ ل بەر بوون، پەنتەرۆنێن وان ب ڕەنگێن پیڤازی و زەر و شین بوون و قەمیسێن وان ژی هندەك وێنەیێن جۆراوجۆر ل سەر بوون، هەروەسا دێمێن خوە ژی ب مکیاژی ڕەنگ کربوون، هەموویان ژی هندەك ڕیهێن درێژ هەبوون لێ نزا کا ئەڤ ڕیهە یێن دروستاهی یان ژی دەستکرد بوون، هەروەسا دوو مەیمینك و بزنەك و سەیەك ژی دگەل بوون.

یەك ژ وان خوە وەك سەرۆکێ گرۆپی دا نیاسین و گوت:

"ئەی گوندیێن هێژا، سلاڤ، ئەڤرۆکە جهێ شانازیێ یە بۆ من و هەڤالێن دگەل من دا ئەم بووینە مێهڤانێن گوندێ هەوە یێ جوان."

هەلبەت ئەڤ کەسە گرۆپەکێ لێبۆکان یێ هونەری بوون کو یەك بوو ژ سەدان وان گرۆپێن گەڕۆك یێن ل گوند و باژێران دگەڕیێن و کارێن سەیر و ڤەشارتن و شانۆگەریان پێشکێش دکەن.

پاشی وی کەسی گوت:

"خەلکێ باژێرێ کرمان گوتە مە کو ئەڤرۆکە ڕۆژا بازارکرنێ یە ل گوندێ هەوە، لەورا مە لەز کر هەتا ئەم گەهشتینە گوندێ هەوە، ژبەرکو مە ڤیا پشتی ڕۆژا هەوە یا درێژ و پڕی واستیان، ئەم پیچەکا کەیف و خوشیێ بێخینە سەر لێڤێن هەوە و زارۆکێن هەوە."

پشتی گوتنا ڤان پەیڤان، وی کۆمەکا کاغەزێن بچووك یێن ڕەنگ فەیروزی بلندکرنە ئاسمانی، بەری ئەو کاغەز بهێنە خوارێ، وی دووبارە و سێبارە هندەك کۆمێن دی بلند کرن هەتا کو وەکی هندەك دیمەنێن جوان و ڕۆناهییێن تەیسۆك ل ئاسمانی دیار بووین.

ل دووڤ دا وی هندەك پارچەییێن شریناهییێن نخافتی ب کاغەزێن ڕەنگاوڕەنگ یێن جوان بلندکرن و گوتە زارۆکان:

"ئەڤ شریناهیە بۆ هەوەنە، یەلا هەر یەك ژ هەوە بۆ خوە شریناهیەکێ ڤەگریت."

هەر زوو ئەو زارۆکێن ل وێرێ خڕڤەبووین خوە د شیریناهیان وەرکرن.

ل وی دەمی، خەلکێ گوندی هەموو مابوونە بێدەنگ و ڕاوەستیایی و تەماشەی وان دکر.

مەلا حەسەن ژی کو هێشتا ل سەر پێسترکا گەڕۆك یێ ڕاوەستایی بوو و قورئانا وی د دەستێن وی دا بوو، ل هەردوو ڕەخێن وی ژی ئیبراهیم و مورتەزا و ل بەر سینگێ وی ژی سورەیا یا ڕاوەستایی بوو، ل پشت وان ژی کۆمەکا ژنان د ڕاوەستیایی بوون و کارێ وان ب تنێ گری و کرنا لاڤایان بوو.

سەرۆکێ گرۆپی گوت:

"هیڤی دکەین ل مە ببورن ئەگەر مە هوون مژوول کربن، مە نەزانی کو نوکە دەمێ نڤێژێ یە، هیڤیدارین پشتی هوون ژ کرنا نڤێرێ ب دوماهی دهێن بهێنە دەڤ مە، نوکە ئەم دێ بەرهەڤیێن خوە کەین و ل هیڤیا هەوە بین، مە گەلەك کارێن جوان و سێر و یارییێن ڤەشارتنێ و شانۆگەری بۆ هەوە یێن ئامادە کرین، هوون هەموو د داخواز کرینە ژ بۆ دیتنا ڤان یاریان، زارۆك، ژن، زەلام، هوون هەموو."

ل وی دەمی پیچەکا دوودلیێ ل سەر رویێ خەلکی پەیدابوو ژبەرکو هەموویان دڤیا بچنە دەڤ وی گرۆپی.

لێ هەر زوو موختاری هەست ب ڤێ چەندێ کر و گوت:

"گەلی خەلکی، نوکە مە کارەك یێ هەی دڤێت ب دوماهی بینین، پشتی هینگێ هوون هەموو دشێن بچنە دەڤ وان، هوون گەلی زارۆکان، هوون ژی دشێن تەماشەی یارییێن ڤان لێبۆکان بکەن لێ پشتی ئەم کارێ خوە ب دوماهی دئینین."

دگەل گوتنا ڤان پەیڤان ژی، موختاری و مەلای هێشتا تێ دئینا دەر کو هزرا خەلکی نەمایە ل سەر وان و بەرێ وان یێ ل ڤی گرۆپی، ژبەر

هندێ مەلا دووبارە چوو سەر پێسترکێ و دەرسوکا خوە دروست کر و گوت:

"نوکە ب ئانەهیا خودایی ئەم دێ دەست ب کارێ خوە کەین."

موختاری ئاماژە کرە زەهرایێ داکو بەرەڤ وی ڤە بهێت.

— زەهرا، نوکە دەستێ گونەهبارێ بگرە و ل دووڤ من وەرە، تو و ژنێن دی ژی بلا ئەو ژی بهێن.

موختاری ل جهێ خوە یێ ڕاوەستیایی بوو و ل لایەکی وی مەلا بوو و ل لایێ دی مورتەزایێ بابێ گونەهبارێ بوو، ئەو هەرسێ بەرەڤ وی جهی چوون یێ چالێ لێ هاتیە کۆلان کو ل وی دەمی ترۆمبێلێن گرۆپێ لێبۆکان ژی ل وێرێ د ڕاوەستیایی بوون، ئەڤ چالە نێزیکی چل و پێنج مەتران ژ وان یا دوور بوو.

پشتی هینگێ ڤی گرۆپێ لێبۆکان ئاگەهـ ژ خەلکێ گوندی نەمابوو، هەروەسا دیمەنێ مەلایێ گوندی و پێسترکا گەرۆك و کۆلانا چالەکێ ل نێزیکی ترۆمبێلێن وان، نە تشتەکێ سەیر بوون ژبەرکو وان گەلەك سەیروسەمەر ل سەرانسەری وەلاتی ب چاڤێن خوە یێن دیتین و گەلەك ڕوودانێن سەیرتر ژی هاتینە د ڕێکا وان دا، لێ دبیت ئەڤ دیمەنێ خەلکێ گوندی یێ نوکە بۆ وان یێ نوو بیت، ب تایبەت دیمەنێ نێزیکبوونا خەلکی گوندی ل وێ چالێ و هەر یەکی کۆمەکا بەران ب دەستێ خوە هەلگرتیە و ئایەتێن قورئانێ دخوینن.

سەرۆکێ گرۆپی ڕاوەستیا و هەست ب ترسێ کر و پاشی گازی کرە هەڤالێن خوە:

"ڕاوەستن، ڕاوەستن، خەلکی یێ بەرەڤ مە دهێت."

ڤی کەسی زێدەتر هەست ب ترسێ کر و خوها ئەنیا خوە پاقژ کر و گوت:

"گەلی خەلکی، گەلی خەلکی، هەوە خێرە؟ مە چ کارێ خەلەت نەکریە؟ ئەگەر ب دلێ هەوە نەبیت بێژن هەڕن نوکە ئەم دێ ژ ڤێرێ چین، یان ژی بێژن هەوە چ ڤێت ئەم دێ وەکەین."

ئیبراهیم و مەلا حەسەن و مورتەزا بێی کو بەرسڤا وان بدەن، بەرەڤ وان دهاتن و ل پشت وان ژی نێزیکی دوو سەد و پێنجی کەسێن تۆڕە و ناڤچاڤ گرێ دهاتن.

موختاری نێزیکی وان بوو و گوتێ:

"مە دڤێت نوکە هوون ژ ڤێرێ بچن، هەڕن ترۆمبێلا خوە ل جهەکێ دی براوەستینن، ما هوون نابینن ئەم د مژوولین و دێ نوکە ب کارەکی ڕابین، هەر نوکە و ب لەز تشتێ من گوتیە هەوە بکەن."

- باشە سەرچاڤا هێژاییێ من، نوکە دێ ژ ڤی جهی ڕابین، بەس هوون مژوولی چنە؟
- ل دەمەکێ نێزیك دێ ب چاڤێن خوە بینن، نوکە تشتێن خوە هەلگرن و هەڕنە بن دارێن هەنێ و ل وێرێ ترۆمبێلێن خوە براوەستینن و تشتێن خوە بدانن، هەکە هەوە بڤێت هوون ژی دشێن تەماشەی مە بکەن کا دێ چ کەین، لێ یا باشتر ئەوە هوون ل جهێ خوە بمینن و مایێ خوە د مە نەکەن.

ڤان مێهڤانێن ل ڤێ ئێڤارێ هاتینە گوندی چ پرسیارێن دی ژ ئیبراهیمی نەکرن، هەر زوو وان کەلوپەلێن خوە ڕاکرن و گیانەوەر ژی دانە ب دووڤ خوە ڤە و نێزیکی سیهـ مەتران ژ وان دوور کەفتن.

موختار ل دور خوە زڤڕی و گوتە زەهرایێ نوکە گونەهبارێ بینە ڤێرێ.

دەمێ ژن هاتینە پێشیێ، زەلامان خوە دا پاش و پیچەکێ چوونە وێڤە، وان هەر شەش ژنان عەبایێن ڕەش ل بەر بوون و ب تنێ یەك ژ وان ژ سەری هەتا بنی ب تنێ خوە نخافتبوو، ل پشت وان ژی ب دەهان زەلام هاتن کو تابۆك و بەر د دەستێن وان دا بوون.

ب دیتنا ڤی دیمەنی، گرۆپێ لێبۆکان گەلەك تڕسیان و هزرکر د هندێ دا کرن هەر نوکە ژ گوندی بڕەڤن، لێ وان بێهنا خوە فرەهکر و بڕیاردا خوە ژ خەلکێ گوندی دوور بکەن و تێکەلی وان نەبن داکو بزانن کا دێ چ ڕوودەت.

دەمێ زەهرا و سوڕەیا نێزیکی چالێ بووین کو ب تنێ نەهـ مەتران ژێ د دوور بوون، موختاری داخواز ژێ کر د جهێ خوە دا بڕاوەستن.

— ئەڤ دووراتیە بەسە، نوکە ل پشت خوە بزڤرن و بەرێ خوە بدەنە مە داکو خەلك هەموو هەوە ببینیت.

ئەڤ هەردوو ژنە ل دور خوە زڤڕین و بەرێ خوە دانە خەلکی، ل ڕێزا پێشیێ یا خەلکی، مەلا و بابێ سوڕەیایێ و هەڤژینێ وێ و هەردوو کوڕێن وێ و هاریکارێ موختاری و ئەو زەلامێ کورە یێ هەموو گاڤان ب

دووڤ وان ڤه د ڕاوەستیایی بوون. خەلکی بەرەك کربوو د دەستێ وی زەلامێ کوره ژی دا.

بێدەنگیێ پەڕێن خوه ب سەر وێ گۆڕەپانێ دا ئینانه خوارێ. پاشی موختاری داخواز ژ زەهرایێ کر کو عەبایی ل سەر سەروچاڤێن گونەهبارێ لادەت. زەهرایێ ب دلێ خوه ئەو کاره ئەنجامدا و پاشی دەستێ سوڕەیایێ بەردا و زڤڕی چوو پشت وێ ڕاوەستیا و عەبایێ وێ ژ سەر سەروچاڤێن وێ ڕاکر کو بەری هینگێ وێ دانابوو سەر سەرێ وێ داکو وێ ژ چاڤێن خەلکێ گوندی بپارێزیت.

سوڕەیایێ هەردوو چاڤێن خوه دانابوونه سەر یەك و لێڤێن خوه ژی ب هێز ل سەر یەك شداندبوون، دێمێ وێ گەلەك زەر ببوو و دەڤێ وێ پیچەکێ دلەرزی. ب ڕەنگەکێ نەچاڤەڕێکری، خەلکی کره هەوار:

"دەهمەن پیس، ژنا دەهمەن پیس، مرن بۆ تە بیت، مرن بۆ تە بیت."

خەلکی دەستێن خوه بلندکرن داکو خوه بەرهەڤ بکەن بەران تێوەر بکەن، موختار دناڤبەرا سوڕەیایێ و زەهرایێ و خەلکێ گوندی دا ڕاوەستیا و گوت:

"هەڤالێن من، نوکه دەم هات، پێدڤیه ئەم وی سزایی بجهبینین یێ خودایی فەرمانا مە پێ کری."

یەکی گوت:

"دێ نوکه بجهئینین، ئەم گەلەك ماینه ل هیڤیا ڤێ چەندێ."

یەکی دی ژی گوت:

"تو ڕاست دبێژی، ڤی کاری گەلەك ژ دەمێ مە بر، پێدڤیە ب زووترین دەم ب دوماهی بینین و بچینە سەر کارێن خوە. "

موختاری داخواز ژێ کر ئەو بێدەنگیێ بپارێزن، پاشی بۆ وی پێسترکا گەڕۆك ئینا و ئەو لێ سواربوو، ل دووڤ دا وی گوت:

"مورتەزا ڕەمەزانی دێ یەکەم بەر تێوەر کەت، ئەگەر ڤێ نەکەفت، دێ بەرەکێ دی دەینەڤێ، د ڕاستی دا ئەم دێ گەلەك بەران دانینە بەر دەستێ وی هەتا یەك ڤێ دکەڤیت، پاشی دێ گەڕا عەلی هێت."

کەسەکی ژ گوندیان گوت:

"ئاها ئەڤەیە دادپەروەری، هەر بژیت مورتەزا."

موختار ل سەر ئاخفتنا خوە بەردەوام بوو:

"پاشی دێ گەڕا مەلا حەسەن لاجیفاردی هێت ب ساخلەتا نوونەرێ خودایی و مەلایێ گوندی."

گازیێن تۆڕەبوونێ بلند بوونەڤە:

- سوپاس بۆ خودایی، هەر بژیت مەلایێ مە، بژیت هێژایێ لاجیفاردی.
- ل دووڤ دا دێ گەڕا هەردوو کوڕێن گونەهبارێ، حسێنی و حەسەنی هێت، ئەڤە ژ سپێدێ وەرە ئەو ژی گەلەك وەستیایینە و ب ڤێ چەندێ نامیسا وان دێ پاقژ بیت و بۆ وان زڤڕیتەڤە.

پاشی وی سەحکرە خەلکی و گوتیێ:

"ل دوماهییێ دێ گەڕا هەوە هێت، وە هەموویان ماف یێ هەی ڤێ ژنا بێ بها بڕەجمینن، ئەو ژنا نامیسا گوندێ مە ب کارێن خوە یێن چەپەلێ و خڕاب پیسکری."

ب گوهلێبوونا ڤان ئاخفتنان، دەنگێ ڤێژیێن کەیفێ یێن خەلکی بلند بوو و ئەڤە یەکەم جار بوو ئەو هۆسا ب کەیف، هەموویان دەستێن خوە ئەوێن بەر تێدا بلند کرن و پیچەکێ بەرەڤ پێشڤە هاتن.

موختار ژ پێسترکێ هاتە خوارێ و داخواز ژ زەهراییێ کر عەباییێ سوڕەیاییێ ژ بەر بکەت.

ئاها ل ڤی دەمی بۆ زەهراییێ دیار بوو کا ئێدی چارەنڤیسێ خوارزایا وێ چیە، ئێدی چ ڕێك یان فێل نینن ئەو وێ ژ دەستێن وان قورتال بکەت. وێ عەباییێ وێ ژبەر کر داکو ئەو ب کڕاسێ سپی یێ بووکینییێ دیار ببیت.

چاڤێ مورتەزای ب گەردەنا سوڕەیاییێ کەفت دیت ئەو ڕستك یا کریە بەر خوە یا بابێ وێ ل ڕۆژا حەفتێ ژ وەغەرکرنا دایکا وێ شەوکەتێ کریە دیاری بۆ وێ، بابێ وێ لێ کرە ڤێژی و گوتیێ:

"وێ ڕستکێ ژ ستۆییێ خوە بکە ئەی کچا بێ قیمەت، ئەڤ ڕستکە یا دایکا تە بوو، ئەو ژنەکا پاقژ و خۆدان شەڕەف بوو، لێ تە ئەڤرۆکە سەرێ من چەماند."

دگەل گوتنا ڤان ئاخفتنان، بێهنا بابێ وێ تەنگ بوو کەفتە سەر ئەردی.

زەهرایێ ڕستکا زێڕی ژ ستۆیێ سوڕەیایێ کر و دا ڤ موختاری و وی ژی پشتی مورتەزا ژ ئەردی ڕاکریەڤە ڕستك کرە د دەستێ وی دا.

مورتەزایی گوت:

"ئەی کچا بێ قیمەت و خۆفرۆش، ئەوا تە نامیسا خێزانا من پیسکری، نوکە بزڤڕە وێ ئاخێ یا تو ژێ هاتی."

ب هشیاریەکا زێدە، زەهرایێ دەستێ سوڕەیایێ گرت و بەرەڤ وێ چالێ بر یا بەری هینگێ بۆ هاتیە کۆلان. زەهرایێ گوتێ:

"کچا من، دوعا ژ خودایی بکە، دوعا ژێ بکە تە ب هێز بێخیت و خوە ل بەر ئێشانێ بگری، خودا یێ ل هیڤیا تە و دەرگەهێن بەهەشتێ بۆ تە یێن هاتینە ڤەکرن، دوعا بۆ مە ژی بکە، چونکی ئەم ژی نزانین کا ئەم چ دکەین."

زەهرایێ دڤیا تێر خوارزایا خوە هەمبێز بکەت لێ وێ ئەڤ چەندە نەکر بەلکو وێ ب هێز دەستێ وێ گرت و بۆ ماوەیەکێ کورت ڤان هەردوو ژنان تەماشەی هەڤدوو کر هەروەکی ئەو یێ بۆ دوماهیك جار خاترا خوە ژ هەڤدوو د خوازن.

ل وی دەمی، موختاری گازی کرە زەهرایێ:

"زەهرا خانم، نوکە ژ وێرێ وەرە، وەرە دەڤ مە."

سوڕەیایێ پشتا خوە دا خەلکی و ب دووراتیا مەترەکێ ژ چالێ ڕاوەستیا، پرچا وێ یا درێژ د سەر ملێن وێ دا هاتبوو خوارێ و گەهشتبوو ناڤتەنگا وێ.

موختاری داخواز ژێ کر ل پشت خوە ب زڤڕیت داکو بەرێ وێ بکەڤیتە خەلکی.

ئەو ل پشت خوە زڤڕی و سەرێ خوە بلند کر، لێ ڤێ جارێ وێ چاڤێن خوە نەنقاندن بەلکو ب سەربلندی ڤە وێ تەماشەی گوندیان کر بێی کو چاڤێن خوە بلڤلڤینیت ژی. چاڤێ سوڕەیایێ ب شوکرللاهێ جەلیلی و موحەمەد عەلی کەفت کو هەردوو هاریکارێن موختاری بوون.

ل دووڤ دا وێ سەحکرە حەسەنی ئەوێ کەسایەتیا خوە یا پیس ل بن جلێن مەلاتییێ ڤەشارتی و ژ هەر جارەکا بەری نوکە، پتر دەڤێ خوە ژ قەستا دلڤلڤاند و زکر و دوعا دکرن، هەروەسا عەلی و هەردوو کوڕێن وێ ژی ل وێرێ د ڕاوەستیایی بوون و بەر د دەستێن وان دا بوون.

سوڕەیایێ بابێ خوە ژی دیت کو یێ شەرم ژ خوە دکەت و دلەرزیت، دەمێ وێ یەکسەر تەماشەی بابێ خوە کری، بابێ وێ سەرێ خوە چەماند.

هەروەسا موختارێ گوندی، حەجی ئیبراهیم و مەهدییێ گوشتفرۆش و ڕەسولێ دارتاش و مەسعودێ سەرتڕاش و گشت زەلامێن دی یێن گوندی ل وێرێ د ڕاوەستیایی بوون و هەموویان ژی بەر ب دەستێ خوە هەلگرتبوون.

**ل دوماهیێ ژی چاڤێ وێ ب خالەتا وێ یا هەژار و لاواز زەهرایێ کەفت کو ب خورتی وێ ئەو دناڤ وێ کوما ژنان دا ددیت.**

# بەشێ حەفتێ

تیپا هونەری یا گەڕۆك ئەوا ل وێ ئێڤارێ سەرەدانا گوندێ کوبایێ کری، خوە ژ خەلکی دوور کر و مایێ خوە د کارێ وان نەکر ژبەرکو ئەو ترسیان تۆڕەبوونا گوندیان ببیتە ئەگەرێ دەرێخستنا وان ژی یان زیانێ بگەهینن کەلوپەل و یارییێن وان یێن هونەری.

وان ترۆمبێل و گیانەوەرێن خوە ل بن هندەك داران ڕاوەستاندن و گیانەوەرێن خوە ژی کرنە د ترۆمبێلان دا، لێ وان جلوبەرگێن خوە یێن لێبۆکان ژبەر خوە نەکرن. دەمێ ڕێورەسمێن ڕەجماندنا سوڕەیایێ دەستپێکرین، وان چەند پێنگاڤەکان خوە نێزیکی خەلکی کر داکو ڤی دیمەنێ سەیر ب چاڤێن خوە دبینن.

ڤی گرۆپی بۆ ماوەیێ چەندین سالان ئەڤ کارە ئەنجامددا و د ماوەیێ گەڕیانێن خوە دا بۆ گوند و دەڤەرێن جودا جودا یێن وەلاتی، وان گوهـ ل گەلەك چیرۆکێن سەیر بوویە و گەلەك ڕوودان ژی ب چاڤێن خوە دیتبوون لێ ئەڤە یەکەم جارە ئەو ڕوودانەکا کوشتنا ب ڤی ڕەنگی ب چاڤێن خوە دبینن.

پشتی پەیدابوونا شۆڕەشا ئیسلامی، ئێدی دەنگوباسێن سێدارەدان و کوشتن و بەرزەکرنێ ڕۆژ بۆ ڕۆژێ د زێدەبوونێ دا بوون و خەلکی هەموویان گوهـ ل ڤێ چەندێ ببوو، لێ بۆ ڤی تیپا گەڕۆك، ئەڤە یەکەم جار بوو ئەو ڕوودانێن وان بەری نوکە ل دور کوشتنێ گوهـلێبووین ب

هندەك ديمەنێن زيندى ب چاڤێن خوە ببينن نەخاسم ڕەجماندنا ژنەكێ هەتا گيانێ خوە ژ دەستددەت.

ب ئاماژەكرنەكا موختارى، هەر يەك ژ شوكرللاهـ و محمدى هاتنە ڕێزا پێشيێ يا خەلكى.

ئەو ژنا دا هێتە ڕەجماندن ژى ب سەربلندى ل بەرامبەرى وێ كۆما خەلكى ڕاوەستيابوو و دوماهيك چركەيێن ژيانا خوە د خواندن، وێ بەردەوام تەماشەى خالەتا خوە يا دانعەمر دكر ئەوا كو خوە بۆ خۆلەكەكێ ژى پشتا وێ بەرنەداى و دڤيا وێنەيێ وێ دوماهيك ديمەن بيت ئەو د ژيانا خوە دا دبينيت.

ل دووڤ دا، موختارى داخواز ژ ڤان هەردوو زەلامان كر هەردوو دەستێن سوڕەيايێ ژ پشت ڤە گرێبدەن و بكەنە د وێ چالێ دا يا بەرى نوكە بۆ هاتيە كۆلان.

ل ڤێرێ خەلك دچوونە بن گوهێن هەڤدوو و دئاخفتن، ژبەركو ئەڤ جارە ب ڕاستى ڕێوڕەسم دەستپێكرن. ئەو هەموو ئەڤە سپێدێ وەرە ل هيڤيا ڤێ چەندێ بوون، ئەو نوكە گەلەك يێن ماندى بووين و هەموويان بەر يێن ب دەستێ خوە هەلگرتين و چاڤێ وان يێ ل سوڕەيايێ كا چەوا وەكى لەشەكێ مرى ئەو دانايە دناڤ گۆڕەكى دا و بەڕەڤانيێ ژ خوە ناكەت، هەروەسا ئەو يێ ل هيڤيا بڕيارا موختارى داكو وێ بڕەجمينن.

پشتى وان سوڕەيا كريە د چالێ دا، وان ب مەڕبێلان ئاخ هاڤێتە د چالێ دا ڤە و دگەل هەر هاڤێتنەكێ وان ناڤێ خودايى دئينا ژبەركو وان هزر دكر ئەو يێ ڤى كارى بۆ خودايى دكەن.

زەهرایێ هەست ب هندێ کر کو ڤان زەلامان کارێ خوە ب ڕێزگرتن و دروست ئەنجامدا، ژبەرکو وان ب چ ڕەنگان زیان نەدگەهاندە سوڕەیایێ یان سڤکاتی ب وێ نەدکر هەروەکی کا چەوا گەلەك جاران پۆلیس سڤکاتیێ ب تاوانباران دکەن.

هەروەسا ڤان زەلامان گەلەك ب هشیاری و هێدی ئاخ دهاڤێتە د چالێ دا داکو کراسێ سوڕەیایێ یێ سپی پیس نەبیت و ئاخ نەمینتە پێڤە. پشتی موختاری گوتیێ ئەڤ چەندە بەسە، وان مەڕبێل و کەلوپەلێن خوە دانانە ڕەخەکی و ژ وێرێ هاتن.

لەشێ سوڕەیایێ هەتا سەر ملێن وێ و دەستێن وێ د دناڤ چالێ دا هاتە بن ئاخکرن. پرچێ وێ یێ درێژ ژی ب سەر ملێن وێ دا هاتبوو خوارێ و کەفتبوو سەر ئەردی، نوکە وێ ئاگەهـ ژ چ تشتان نەمابوو، وێ چ تشت نەددیتن و چ تشت گوهلێنەدبوون.

ل دووڤ دا موختاری گوت:

"سوڕەیا مانوچەهری، نوکە دەمێ بجهئینانا فەرمانا خودایێ مەزنە، نوکە ئەو دەم هات تو سزایێ شاشیێن خوە وەربگری، ئەرێ تە چ ئاخفتن هەیە؟ تە دڤێت بەری بهێیە ڕەجماندن تشتەکی بێژی؟"

سوڕەیایێ چ بەرسڤ نەدانێ، هەتا وێ چ پووتە ب ئاخفتنا وی نەکر و تەماشەی وی ژی نەکر.

موختار نەچار بوو ئاخفتنا خوە دووبارە بکەت:

"ئەگەر تە تشتەك هەبیت نوکە بێژە، چونکی پشتی چەندەکا دی تە ئەو دەلیڤە ژی نابیت و هەموو تشت دێ ب دوماهی هێن."

بێدەنگیەکا کوور ب سەر خەلکی دا هات، بەرێ هەموویان یێ ل سوڕەیایێ بەلکی چاڤێن خوە بلڤینیت یان لێڤێن خوە ژ سەر یەك ڕاکەت و تشتەکی بێژیت، لێ د هەمان دەم دا زەهرایێ باش دزانی خوارزا و هەڤالاً وێ یا گەنج ژ نوو چ تشتێن دی نابێژیت.

بۆ جارا سێیێ ژی موختاری هەمان پرسیار ئاراستەی سوڕەیایێ کر، لێ وێ هەروەکی بەری نوکە بێدەنگی هەلبژارت و چ پەیڤ ژ دەڤێ وێ نەدەرکەفتن. پشتی موختار پشتڕاست بووی سوڕەیایێ چ ئاخفتن نینە بێژیت، خوە پیچەکێ گرت و پاشی بەرێ خوە دا مورتەزای و پرسیار ژێ کر:

"هێژا مورتەزایێ ڕەمەزانی، تو وەك بابێ گونەهبارێ، تە چ ئاخفتن هەیە بێژی؟"

ڤی زەلامێ دانعەمر و پشت خوار بزاڤ کر خوە ڕاست بکەت و پاشی ب دەنگەکێ بلند گوتی:

"ئەوا خودایی حەز کری دێ ئەو بیت، ئێدی ئەو نە کچا منە و ئەز ژی نە بابێ وێ مە، نوکە ئەو کەسەکا بیانی یە و بلا سزایێ وێ هەر نوکە بهێتە بجهئینان."

دەنگێ هندەك گازیان بلند بوو

"هەر بژیت هێژایێ ڕەمەزانی، ئاخفتنا وی یا دروستە، بلا هەر نوکە سزایێ وێ بهێتە بجهئینان."

ل دووڤ دا موختاری بەرێ خوە دا مەلا حەسەنی و پرسیار ژێ کر:

"هێژا حەسەن لاجیفاردی، تو وەك نوونەرێ ئیمامێ مە یێ مەزن ل گوندی، ئەرێ تە تشتەك هەیە ل سەر ئاخفتنا مە زێدە بکەی؟"

مەلا حەسەنی عەبایێ خوە یێ مەلایان هەژاند و دەستێ خوە یێ قورئان و تەسبیح تێدا بلند کر و گوت:

"نوکە دەم هات ئەم فەرمانا خودایی و ئیسلامێ ل سەر ڤێ ژنا گونەهبار بجهبینین."

ل ڤی دەمی، بەرێ هەموو ئەندامێن تیپا هونەری یا گەڕۆك مابوو ل وان دیمەنان، ل شوونا ئەو بهێن یاریان بۆ خەلکی بکەن و خەلك تەماشەی وان بکەت، نوکە کاودان بەروڤاژی نە، ئەو یێ تەماشەی خەلکی دکەن و ڕەق وەکی پەیکەران یێن د جهێ خوە دا ڕاوەستیاین. هەروەسا خەلکێ گوندی ژی ژبەر ڕەجماندنا سوڕەیایێ، کەسێ ئاگەهـ ژ وان نەمایە.

ل ڤێرێ هەموو تشت دەستپێکرن.

موختاری ب دەستێ خوە ئاماژە کرە خەلکی چەندین پێنگاڤان بەرەڤ پاشڤە بزڤرن، پاشی وی وەریسکەك ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و ب دووراتیا شەش مەتر و نیڤان پیڤا، پاشی وی ئەڤ وەریسکە قەتاند و دا ڤ هاریکارێ خوە شوکرللاهـ ی و گوتێ:

"درێژاهیا ڤی وەریسکی دناڤبەرا شەش و نیف بۆ حەفت مەتر و نیڤایە، هەرە بازنەیەکێ ل دورماندوری چالێ پێ بکێشە و دورماندوری وێ ژی ب هندەك بەران بدانە.

شوکرللاهـ ی بازنەیەك ل دورماندوری چالێ کێشا و سەرێ سورەیایێ د ڤێ بازنەیێ دا بوو.

نوکە دەپێ شانۆیێ ژی هاتە ئامادەکرن، نوکە ئارمانج بۆ خەلکی یا دیارە و هەموو دزانن دێ بەرا داننە کیرێ، وان هەموویان ستێرکا خوە باش یا گرتی داکو د ڤێ یاریا ترسناك دا ب سەرکەڤن. خەلك هەموو ل دور وێ بازنەیێ خرڤەبوون و هەموو تا وی رادەی د بێدەنگ بوون خوە هەکە وێ گاڤێ پەرێ باڵندەیەکی کەفتبا سەر ئەردی، رەنگە ژبەر بێدەنگیێ، وان هەموویان گوهـ ل دەنگێ کەتنا وی بایە.

خەلکی هۆسا خوە ئامادە کربوو دا بێژی وان یا خوە بۆ رێورەسمێن هەلکەفتنەکێ یان جەژنەکێ ئامادەکری و وان ئەڤ هەلکەفتنە ژ باب و باپیرێن خوە یا وەرگرتی و ئەڤە چەندین سالە ئەو پێ رادبن و تێدا د شارەزانە.

ئەندامێن تیپا هونەری ژی دڤیان پتر خوە نێزیکی گورەپانا شانۆیێ بکەن و بچنە دناڤ خەلکی دا، لێ ئەو دترسیان هندەك کەس بەران د وان ژی وەرکەن لەورا ئەو چوونە لایێ پشت سورەیایێ و هۆسا ئەو ژ خەلکی د دوور بوون. خەلکێ گوندی ژی یێ بەر د دەستێن وان دا، نێزیکی چواردە بۆ پازدە مەتران ژ سورەیایێ د دوور بوون، ئانکو ب تنێ وان پرچا وێ یا تاری ئەوا ل سەر ئەردی بەلاڤ بووی ددیت.

موختاری دەست هاڤێتە بەرەکی و کرە د دەستێ بابێ سوڕەیایێ دا و گوتێ:

"نوکە جهێ شانازیێ یە بۆ تە داکو یەکەم بەر د وێ وەرکەی و نامیسا خوە پاقژ بکەی."

ڤی پیرەمێرێ دانعەمر گوپالێ خوە دانا ئەردی و بەر ب دەستێ خوە گرت و پاشی سوپاسیا خودایی کر، وی دەستێ خوە بۆ پشتێ بر و هندی هێز د لەشێ وی هەی بەر د سوڕەیایێ وەرکر و گوت:

"سوپاس بۆ خودایی، ها بگرە ئەی ژنا دەهمەنپیس، ها ئەڤەیە سزایێ تە."

بەرێ وی ب ئارمانجا خوە نەکەفت لەوڕا موختاری بەرەکێ دی داڤێ داکو دووبارە د وێ وەربکەت، لێ بۆ جارا چوارێ ژی ئەڤ پیرەمێرێ دانعەمر نەشیا چ بەران ب دروستاهی د کچا خوە وەرکەت، ل دوماهیێ گوت:

"کا بەرەکێ دی ژی ب دەنە ڤ من داکو ئەڤ جارە ئەز قەرقودێ سەرێ وێ بهەڕشینم."

ئیبراهیمی بۆ پیرەمێرێ دانعەمر دیارکر نابیت ب چ ڕەنگان ئەو ژ هێلا سپی دەرباز بیت چونکی ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەر ئەو ژ سنوورێن خودایی دەرکەڤن.

پشتی ئەو پیرەمێر ل دوماهیێ شیایی بەرەکی ل سەرێ کچا خوە بدەت، نوکە گەڕا عەلی هات، وی کۆمەکا بەران دانابوو بەر پێن خوە و ل هیڤیا موختاری بوو داکو ئاماژەییێ بدەتە وی ئەو ژی کارێ خوە بکەت.

موختاری گوتیێ:

"کوڕێ من نوکە گەڕا تەیە، هیڤیا من ئەوە خودا هاریکارێ تەبیت و دەستێ تە دروست بەرێ خوە ل ئارمانجێ بدەت."

هەڤژینێ سوڕەیاییێ دەست هاڤێتە بەرەکی و هندی هێز د لەشێ وی ژی هەی ب لەزاتیا بروسییێ بەرەك د هەڤژینا خوە وەرکر، لێ بەرێ وی ژی ب ئارمانجا خوە نەکەفت و نێزیکی پازدە سانتیمەتران د بەر سەرێ وێ ڕا چوو، سوڕەیاییێ قەت خوە نەدترساند و خوە لڤینەك ژی نەدکر.

هەڤالێن وی دەستێ خوە ل پشتا وی دا و گوتنێ:

"دەستخۆش عەلی، هاڤێتنەکا باش بوو، لێ بزاڤا خوە دووبارە بکە ئەو جارە سەرێ وێ بشکێنە."

عەلی بەرەکێ دی هەلگرت و دڤیا قەبارە و سەنگا وی بپشکنیت، لەوڕا ل دەستپێکێ بەر بلندکر و پاشی ڤەگرتەڤە و تەماشەی دەوروبەرێن خوە کر دا بێژی ئەو یاریکەرەکێ ب ناڤودەنگە و خەلك هەموو یێ ل هیڤیا وی دا نمرەکا پیڤیایی تۆمار بکەت.

پاشی دووبارە وی دەستێ خوە بەرەڤ پشتێ بر و ب هێز بەرێ دووێ د هەڤژینا خوە وەرکر، لێ ڤێ جارێ ژی هەر بەر ب ئارماناجا خوو نەکەفت، جۆرەکێ دلساڕبوونێ ل دەڤ خەلکی پەیدابوو، لێ هەر زوو عەلی

دەست هاڤێتە بەرەکێ دی و ئەڤ جارە خوە ب لایێ ڕاستێ یێ سینگێ وێ کەفت.

بێهنا وی ب ڤێ چەندێ نەهات بەلکو دەست هاڤێتە بەرێ چوارێ و ئەڤ جارە باش ستێرکا خوە گرت و بەر خوە ل نیڤەکا ئەنیا وێ دا، ڤی بەری پیستێ ئەنیا وێ شەق کر و خوین ژێ هات.

کەیفا خەلکی گەلەك ب ڤێ چەندێ هات و هەموویان کرە هەوار و دەستخۆشی ل عەلی کر. خەلکی هێدی هێدی خوە نێزیك دکر هەتا وان سنوورێ وێ هێلێ ژی بڕی یا بەرێ بۆ هاتیە کێشان داکو ژێ نەبورن.

ل دووڤ دا گەڕا هەردوو کوڕێن وێ هات، هەر یەك ژ وان ژی بەرەك د دایکا خوە وەرکر، بەرێ یەك ژ وان ب سەرێ وێ کەفت و جوکێن خوینێ ژ سەرێ وێ باراندن، دیسا خەلکی بۆ وان ژی کرە هەوار و دەستخۆشی لێکر.

ئەڤە یەکەم جارە تیپا هونەری یا گەڕۆك ڤی دیمەنی ب چاڤێن خوە دبینن، ب ڕاستی ژی ئەڤە سەیرترین ڕوودان بوو د ماوەیێ گەڕیانێن خوە دا ب چاڤ دیتی، هەلبەت بۆ وان ژی دیمەنەکێ گەلەك ب ترس بوو و خوە یەك ژ وان پێنگاڤەکێ ژی نەدوێریان خوە نێزیکی خەلکی بکەت.

ل دووڤ دا گەڕا مەلا حەسەنی هات، وی قورئانا خوە کرە د دەستێ خوە یێ چەپێ دا و ب دەستێ ڕاستێ ژی بەرەکێ مەزن هەلگرت، لێ بەری ئەو بەرێ خوە بهاڤێژیت، تەماشەی خەلکی کر و گوت:

"ئەز ب خوە بەری نادانمێ بەلکو خودایی فەرمان یا ل دەستێ من کری و نیشا وی دایی ڤی بەری د گونەهبارێ وەرکەت، پشتی من دێ گەڕا هەوە هێت و هوون ژی ب دلێ خوە دێ وێ ڕەجمینن."

خەلکی دەست بۆ وی قوتان و کەیفا وان ب ڤان گوتنێن وی هات.

پشتی شڕکێن خوینێ ب سەرێ سوڕەیایێ دا هاتینە خوارێ و ئەرد ژ خوینا وێ تەڕبووی، زەهرا ژ وی جهی چوو ژبەرکو وێ دزانی پشتی چەند خۆلەکێن دی یێن کێم دێ گیانێ وێ یێ پیرۆز ژ لەشێ وێ دەرکەڤیت و مرن دێ وێ هەمبێز کەت. ئێدی ئەو پتر نەشیا خوە ل بەر وی دیمەنێ خویناوی بگریت، ئەو دیمەنێ هندەك گوندیێن هەژار و بێ ئاریشە نوکە بووینە هندەك مرۆڤێن دڕندە و کوژەك.

دلێ زەهرایێ تژی خەم و کۆڤان بوو، ئێدی نەشیا خوە ل سەر پێن خوە ژی بگریت، پاشی ئەو ل سەر پارچەیەکا داری ڕوونشتە خوارێ کو ل بەر دەرگەهێ دوکانا نانپێژێ گوندێ یێ دانایی بوو.

هەردەمێ وێ گوهـ ل ڤێژیەکا خەلکی بایە، وێ دزانی بەرەکێ دی ژی ب سەرێ سوڕەیایێ کەفت، نوکە ئەو یا لومەی ژ خوە دکەت و هەست ب شەرمێ دکەت چونکی وێ بزاڤێن مەزن نەکرن خوارزایا خوە ژ دەستێ وان بینتە دەرێ یان ب هەر ڕێکەکا هەبیت وێ قورتال بکەت ئەڤە ل دەمەکی کو وێ هەموو هێز و شیانێن خوە ژی مەزاخت بوون.

حەجی ئیبراهیمی هەموو گاڤان گەلەك ڕێز لێ دگرت و بۆ گەلەك کاران ژی بۆچوونا وێ وەردگرت، لێ پشتی مەلا حەسەن هاتیە د گوندی دا، ئێدی ئەو زوو کەفتە بن کاریگەڕیا وی و ب ئاخفتنێن وی د سەر دا دچوو،

هەروەسا ژیێ وی یێ مەزن ژی ئەگەر بوو مەلا حەسەن پتر وی بێختە بن کونترۆلا خوە.

پشتی هینگێ هەلویستێ وی ژی دژی سوڕەیایێ ب هێزتر لێ هات، ژبەرکو ژ لایەکێ ڤە سوڕەیایێ خوە ل سەر هەموو تشتان بێدەنگ دکر و گازندێن خوە بۆ کەسێ نەدکرن، ژ لایەکێ دی ڤە عەلی و مەلا حەسەنی بەردەوام پیلان بۆ ژناڤبرنا وێ ددانان.

پشتی هینگێ هەر بێهن بێهنە زەهرایێ د دلێ خوە دا دگوت:

"ئاخ بۆ بەختێ وە یێ ڕەش، خۆزی نوکە من ئەو وێرەکی و ئازایەتی هەبا ئەز شیابام بەڕەڤانیێ ژ خوارزایا خوە یا هەژار بکەم و وێ ژ دەستێ ڤان گورگان قورتال بکەم."

دناڤبەرا شەڤ و ڕۆژەکان دا، ئەو زەهرایا دەمەکی خۆدان دەستهەلات و کەس نەدوێرىيايى ژبەر وێ کارەکی د گوندی دا بکەت، ئەڤرۆکە یا پیر بووی و کەس هزرەکا بچووك ژی بۆ ئاخفتنێن وێ ناکەت، ئەو ب خوە ژی وەکی بەرێ نەیا ئازا و وێرەکە ب تایبەت پشتی پەیدابوونا شۆڕەشێ ل وەلاتی، ڕەوشا وێ ژی وەکی ڕەوشا هەموو ژنێن دی یێن گوندی یە، ئەو هەموو یێن بوینە ئێخسیرێن هندەك یاسایێن زەلامان ب ناڤێ خودایی ژ دەڤ خوە دانایینە.

ئەرێ تو دبێژی حەجی ئیبراهیمی گوهێ خوە دابا وێ هەکە وی هەموو تشتێن ب چاڤ دیتین و گوهلێبووین و هەستپێکرین بۆ وی گوتبان؟ ئەرێ ئەو دا وی ڕازی کەت و باوەریێ بۆ چێکەت؟ ئەڤ چەندە هەموو جهێ پرسیارێ بوون.

لێ ڕاستی بیت وی ژی دەست دگەل ڤێ پیلانا دڕەندە هەبوو، ژبەرکو ئەو ب خوە ژی د ماوەیێ چەند هەیڤێن کێم دا ژ زەلامەکێ دادپەروەر و خودێ نیاس هاتیە گوهۆڕین بۆ زەلامەکێ دلڕەق و خڕاب و حەز ژ مالێ دنیایێ بکەت.

ژ لایەکێ دی ڤە، ل ناڤەندا وێ بازنەیا لەشێ سوڕەیایێ تێدا هاتیە بن ئاخکرن، وێ دوماهیك هەناسەیێن خوە دهەلکێشان، سەرێ و سنگێ وێ یێن تێکچووین و وەکی پارچەیێن گوشتێ نەرم یێن لێهاتین. خەلکێ گوندی ژ ڕێزێن خوە چووبونە دەرێ و وان ب کەیفا دلێ خوە بەر د سوڕەیایێ وەردکرن.

پشتێ ڤێ ڕەجماندنێ، قەرقودێ سەرێ وێ شکەست بوو و ناڤچاڤێن وێ تێکچووبون و دفنا وێ نەمابوو پێڤە و چاڤێن وێ پڕی خوین ببوون و هەستیکێن دەڤێ وێ ژی شکەست بوون و پتریا ددانێن وێ ژی هاتبوونە دەرێ. ئەگەر تە باش تەماشەی وێ کربایە، ب چ ڕەنگان تە نەدزانی ئەڤ دیمەنە یێ ژنەکێ یە ب ناڤێ سوڕەیا.

ل ڕێزا پێشیێ یا خەلکی، مەلا حەسەنی کو پارچەیەکا عەبایێ وی ب خوینێ پیس ببوو، دەستێ خوە بلند کر و گوت:

"هەڤالێن هێژا، ئەز دبێژم فەرمانا خودایی هاتە بجهئینان و ئەوا وی دڤیایی مە بجهئینا، ئەرێ کەسەك هەیە بچیت سەحکەتە ڤێ دەهمەن پیسێ داکو مە ژ مرنا وێ پشتڕاست بکەت.

گەلەك زەلامان دەستێ خوە بۆ ڤی کاری بلند کر، لێ مەلای ب تنێ سەعیدێ بیرکۆلێ گوندی ژ بۆ ڤێ چەندێ دەستنیشانکر، سەعیدی

خوە نێزیکی سوڕەیایێ کر و پاشی گوهێ خوە برە بەر دەڤێ وێ داکو بزانیت کا هەناسەیێن خوە دهەلکێشیت، ژ نیشکەکێ ڤە وی کرە هەوار و گوت:

"ئەڤ گونەهبارە هێشتا یا ساخە، ئەو نەمریە."

زەلامەکی ب هەردوو دەستێن خوە بەرەکێ مەزن هەلگرتبوو و خوە نێزیکی سوڕەیایێ کۆ و ئەو بەر د سەرێ وێ وەرکر، پاشی هندەك زەلامێن دی ژی تابۆك ئینان و شەش جاران ل سەرێ وێ دان هەتا قەرقودێ سەرێ وێ بوویە دوو پارچە و مەژیێ وێ ژێ دەرکەفتی.

ل ڤی دەمی گازیێن وان یێن کەیفخۆشیێ بلند بوون

— الله اکبر، الله اکبر، الله اکبر، الحمدالله."

پاشی حەسەن لاجیفاردی قورئانا خوە بلند کر وەك هێمایەك ژ بۆ سەرکەفتنا وان، ل دووڤ دا وی خەلکێ هەموو ل دورماندوری خوە خڕڤەکر و گوت دا ئەم هەموو پێکڤە سوپاسیا خودایی بکەین.

بەری کو خەلك ل دور مەلای خڕڤەبن، ئەو هەموو ل دور کەلەخێ سوڕەیایێ دزڤڕین و تف دکرنێ، هژمارەکا مێشوموران بەربوونە کەلەخێ وێ یێ خویناوی. زەلامێن تیپا هونەری ژی ژ ترسان دا خوە ژێ دوورکرن، هەرچەندە سەیێ وان خوە نێزیکی کەلەخێ سوڕەیایێ دکر و دوو جاران ل دور زڤڕی لێ ئەو ژی نەدوێریا خوە زێدەتر نێزیکی وێ بکەت.

ل سەر وی دەپێ داری یێ ل بەر دەرگەهێ دوکانا نانپێژێ گوندی، زەهرا هێشتا یا دامایە و هێشتا باوەرناکەت خوارزایا وێ یا هاتیە ڕەجماندن، ژبەر بێدەنگبوونا گازی و هەوارییێن خەلکی، ئێدی وێ زانی سوڕەیاییێ ب تەمامی گیانێ خوە ژ دەستدا و خەلکی ئەو یاسایا وان ب دەستێن خوە دانای بجهـ ئینا.

موختارێ گوندی نێزیکی وێ بوو، لێ وێ سەرێ خوە بلند نەکر و هەست پێ نەکر کەسەك یێ هاتیە دەڤ وێ، موختاری گوتێ:

"زەهرا خانم، نوکە دادپەروەری هاتە بجهئینان، نوکە هەموو تشت ب دوماهی هاتن، ئەرێ تە چ ئاخفتن نینە بێژیە من؟"

وێ سەرێ خوە بلند کر و پشتا خوە ڕاستکر و تەماشەی موختاری کر و گوتێ:

"هەڤالێ من ئیبراهیمێ بەلنگاز، ژ پێش تەڤە ئەز یا هەست ب شەرمزارییێ دکەم، هیڤیا من ئەوە خودا گونەهێن تە ژێببەت و ل تە ببوریت."

موختاری خاترا خوە ژێ خواست و ژێ دوور کەفت، زەهرایێ ژ پشتێ ڤە بەرێ خوە دایێ پشتا وی ژ بەرێ گەلەك خوارتر یا لێ هاتی، لێ قەت دلێ وێ نەما پێڤە.

# بەشێ هەشتێ

ڕۆژ ئاڤا بوو و دنیا بوو تاڕی، سێ سەیێن بەردایی ل دووڤ بێهنا خوینێ بەرەڤ وی جهی هاتن یێ کەلەخێ سوڕەیایێ لێ مای، ل وی دەمی خەلکێ گوندی ژی هەموو چووبوونە مالێن خوە. ل دووڤ یاسایێن وان، کەلەخێ قوربانیێ ژی هێلابوو ل وێرێ داکو ببیتە پەند بۆ هەموو کەسان.

هێدی هێدی، وان سەیان خوە نێزیکی سوڕەیایێ دکر، سەیەکی ژ وان دەڤێ خوە هاڤێتە سەرێ وێ و ب هێز بۆ لایێ خوە ڕادکێشا و بزاڤ دکر ژ لەشێ وێ ڤەکەت، لێ ژ نیشکەکێ ڤە زەهرا ژ جهێ خوە ڕابووڤە دارەك ب دەستێ خوە گرت و هاتە وان سەیان داکو ژ کەلەخێ سوڕەیایێ بدەتە پاش.

— خوە ڤەدەن ئەی گیانەوەرێن، پیس، ژ ڤێرێ هەرن.

زەهرایێ بەرەك د وی سەی وەرکر لێ بەر ڤێ نەکەفت، لێ ئەو پشت و پشت زڤڕی و هندەك بەرێن دی هەلگرتن و د سەیان وەرکرن هەتا ژ وی جهی ڕەڤین، یەك ژ وان سەیان یێ تیپا هونەری یا گەڕۆك بوو، پشتی ژ وی جهی ڕەڤی دووبارە چوو دەڤ خۆدانێن خوە و ڕوونشتە خوارێ، ل وی دەمی هندەك ژ گوندیان د هەوارا زەهرایێ هاتن.

زەهرایێ گوتە ژنەکێ:

"ب لەز هەڕە تشتەکی بینە دا ب سەر کەلەخێ وێ دادەین."

پشتی هینگێ ئەو خەلکێ کێم یێ هاریکارییا زەهرایێ کری و کەلەخێ سوڕەیایێ نخافتی ژی ژ وێرێ چوون و هەر یەك چوو مالا خوە.

ئەو دەم نێزیکی دەمژمێر شەش یێ ئێڤاری بوو، بێدەنگیەکا تەمام ب سەر گوندی دا هاتبوو و بازاڕ ژ خەلکی ڤالاً ببوو ب تنێ هندەك دوکانێن کێم مابوون هێشتا نەهاتبوونە گرتن، هەروەسا هەر بێهن بێهنە دەنگێ گریا زارۆکی دهات یان ژی دەنگێ ژنەکێ دەمێ گازی زارۆکێن خوە دکری داکو بچنە د ژوور ڤە، یان ژی دەنگێ هندەك ڤەلەڕشکان دهات زێدەباری دەنگێ شڕشڕا ئاڤا ڕووباری و دەنگێ لڤینا بەلگێن داران.

ل ڤی دەمی، تیپا هونەری یا گەڕۆك هێشتا د دوودل بوون کا ئەرێ کەلوپەلێن خوە بدانن و یاری و شانۆگەریان نیشا خەلکی بدەن یان ژی ژ وێرێ بارکەن. لێ پشتی هینگێ وان بڕیاردا ئەو وێ شەڤێ بمیننە ل گوندی و دەست ب ئامادەکرنا ڕێوڕەسمێن شانۆگەری و یارییێن خوە کرن.

ئەندامێن باژێرڤانیا گوندی هەموو چووبوونە مالا مەلا حەسەنی ژ بۆ ڤەخوارنا چایێ و کێشانا جگارەیان، ئەو هەموو د ڕوونشتی بوون و مابوونە بێدەنگ، مەلای ل پشت بەرچاڤکا خوە یا ڕەش تەماشەی وان دکر کا هەر یەك ب چ ڤە یێ مژووله. پشتی وی فڕەك ل پەیالا چایێ دایی، گوت:

"موختارێ هێژا، مورتەزایێ ڕەمەزانی و خۆشتڤیێ من عەلی و هەموو ئامادەبوییێن ڤەدرگران، یا پێدڤی بوو ئەم نوکە ل ڤێرێ ڕوونشتینە خوارێ داکو ئەو ڕوودانێن بەری نوکە چێبووین ژ بیرا خوە ببەین، خودایی هۆسا بۆ مە حەزکر نوکە سەرێ مە پیچەکێ ئارام ببیت،

ژبەرکو ئەو کارێ مە کری مە ژبەر حەزکرنا وی ئەنجامدا. ژبیرنەکەن کو ئەڤ ژنە نابیتە یەکەم ژن و دوماهیك ژن ل وەلاتێ مە دهێتە ڕەجماندن پشتی کو یاسایێن خودایی لێ دهێنە بجهئینان، بەری نوکە ب دەهان ژن وەکی وێ یێن هاتینە ڕەجماندن و گەلەکێن دی ژی ئەگەر کارێن وەکی وێ ئەنجام بدەن دێ هەمان سزا وەرگرن.

نابیت ژبەر وی کارێ مە ئەنجامدای خوە بترسینین، سوباهی دێ پەیوەندییێ ب نێزیکترین جهێ پۆلیسان کەین و ڕوودانا ئەڤرۆ بۆ ڤەگێڕین. من دڤێت بۆ هەوە دووپات بکەم کو گوندێ کوبایێ د ماوەیێ چەند دەمژمێرێن بهێت دا دێ بیتە گوندەکێ نموونەیی و ل سەرانسەری وەلاتی خەلك دێ بەحسێ مێرخاسی و باشیا خەلکێ وی کەن."

ل وێ دیوانێ، نێزیکی دوازدە کەسان د ڕوونشتی بوون و هەموویان گوهێ خوە ددا سحبەتێن مەلای ئەوێ چ تشتان ئاخفتنا وی نەدبڕی ب تنێ فرێن چایێ و جگارەیان نەبیت، هەر تشتەکێ مەلای گوتبا، زەلامان هەموویان سەرێ خوە دهەژاند وەك ئاماژەکرنەك بۆ ڕاستیا گوتنێن وی.

ل دووڤ دا وی بەردەوام دا ئاخفتنێن خوە:

"هەڤالێن من، هۆسا دیار بوو کو خڕابیێ جهێ خوە دناڤ گوندێ هەوە دا کربوو، لێ ب حەزکرنا خودایی، ڕێکا من کەتە گوندێ هەوە و هەلبەت ئەڤ چەندە ژی ژ حەزکرنا خودایی بوو داکو ئەز بهێم و گوندێ هەوە ژ خڕابی و گونەهان قورتال بکەم، دڤێت ئەم سوپاسیا خودایی و پێغەمبەرێ وی بکەین."

ل ڤێرێ دەنگی هەموویان بلند بوو هەموویان سوپاسیا خودایی کر و پەسنا مەزناهی و دلۆڤانیا وی کر.

ژ نیشکەکێ ڤە، مورتەزایێ ڕەمەزانی دەست ب گریێ کر و ب هەردوو دەستێن خوە تەپ دانانە سەرێ خوە و گوت:

"ئوی خودا ئەڤە چ بوو هاتیە سەرێ من، ئەز یێ هەست ب شەرمێ دکەم ژبەرکو ئەز ئەڤرۆکە کەسەکێ شەرمزار بووم، یا خودا تو هاریکارییا من بکە، گەلی هەڤالان هوون ژی ل من ببورن."

ئامادەبوویان هەموویان تەماشەی وی کر و دلێ وان ما پێڤە، هەر زوو مەلای ڤیا کونترۆلێ ل سەر ڤی کاودانی بکەت، خوە نێزیکی وی کر و گوت:

"مورتەزایێ هێژا، پێدڤی ناکەت تو خوە بترسینی یان شەرم بکەی، ئەم حەز ژ تە دکەین و ڕێزێ ل تە دگرین ژبەرکو تو مەزنترین کەسی دناڤ مە دا، باش بزانە ئەم دێ بەردەوام بین ل سەر پشتەڤانیا تە و هەر تشتێ تو پێدڤی دبیێ دێ بۆ تە دابین کەین، ئەڤ گوندە هەموو مالا تەیە و دەرگەهێن مە هەموویان بۆ تە دڤەکرینە. ژبیرنەکە تو یەکەم کەس بووی تە بەر د گونەهبارێ وەرکری و پاشی مە چاڤ ل تە کر، تو نموونەکا هەرە بلندی بۆ مە هەروەکی کا چەوا کوڕ چاڤ ل بابێ دکەت و شانازیێ پێ دبەت، لەوڕا ئەم ژی هەموو گاڤان دێ شانازیێ ب تە بەین."

ڤان پەیڤێن مەلای دلخۆشیەکا مەزن بۆ ئامادەبوویان پەیداکر.

هەرچەندە ڤی پیرەمێرێ دانعەمر ب هندەك پەیڤێن کورت سوپاسیا مەلای کر، لێ یێ بەردەوام بوو ل سەر گریا خوە.

ل دووڤ دا حەجی ئیبراهیمی دەست ب ئاخفتنێ کر و گوت:

"ئەرێ کێ ژ مە دەمێ سپێدی ژ خەو هشیاربووی باوەردکر دێ ڕوودانەکا هۆسا یا دلتەزین چێبیت؟ هەلبەت ئەڤ چەندە ژ حەزکرنا خودایی بوو هەروەکی بەری نوکە بەڕێز لاجیفاردی ژی گوتی، مە ئەو تشت ئەنجامدا یێ خودایی فەرمان پێ ل مە کری، لێ گۆمان تێدا نینە، ژبیرکرنا ڕوودانێن ئەڤرۆ دێ ماوەیەکێ درێژ ڤەکێشیت."

عەلی کو ل دووری وان یێ ڕوونشتی بوو، ئاخفتنا وی بڕی و گوت:

"نەخێر، نەخێر، هۆسا نینە، ئەڤ تشتێ تو دبێژی نەیێ دروستە ژبەرکو من ب خوە هەر ژ نوکە ئەو یا ژبیرکری و من هەموو تشت ژبیرا خوە برینە، من نەڤێت ئێدی هزرا خوە د وێ دا بکەم یان ل سەر وێ باخڤم، ل دەڤ من ئەو یا ب دوماهی هاتی."

دگەل گوتنا ڤان پەیڤان، ئەو ڕابوو سەر پێن خوە و پێهنەك ل کورسیکێ دا و پاشی بەرەڤ دەرڤە چوو و د بن لێڤکان ڕا هندەك ئاخفتن دگوتن لێ کەسێ نەدزانی ئەو بەحسێ چ دکەت، پاشی چوو ژ دەرڤە دەرگەهـ ل دووڤ خوە گرت.

پشتی بۆ ماوەیێ بێهنەکێ بێدەنگی کەتیە ژورێ، دووبارە موختاری گوت:

"بهێلن ئەو تشتێ بەری نوکە من گوتی دووبارە بکەم، ئەو تشتێ ئەڤرۆ ژبیرکرنا وی دێ دەمەکێ درێژ ڤەکێشیت ب تایبەت ل دەڤ کەسێن

دانعەمر و زارۆکان، مورتەزا ب تنێ تووشی نەخۆشیێ نەبوویە بەلکو ئەڤ نەخۆشیە یا تووشی مە هەموویان بووی.

مەلای سەرێ خوە هەژاند وەك ئاماژەك بۆ ڕاستیا گوتنێن موختاری.

ل دووڤ دا موختاری بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە:

"نوکە ژی دڤێت بەحسێ ڤەشارتنا سورەیایێ بکەم، ئەز دبێژم مەلا حەسەنی هندەك بۆچوون ژ بۆ ڤێ چەندێ هەنە، مانە هۆسایە مەلا؟"

هەموویان بەرێ خوە دا مەلای ئەوێ پێشبینیا ڤێ پرسیارێ ژ موختاری نەدکری، وی گوت:

"بەلێ، بەلێ من گەلەك بۆچوون دەربارەی ڤێ چەندێ هەنە، دڤێت کەلەخێ وێ هەتا بەری هەلاتنا ڕۆژێ ژی بمینتە ل وی جهی، لێ ئەز یێ پشتڕاستم کو هوون ژی دێ دگەل من د هەڤڕا بن، ئەز دبێژم نابیت ئەم کەلەخێ وێ دناڤ گۆڕستانا خوە دا بڤەشێرین چونکی ئەو نە ژ هەژی جهەکێ هۆسایە."

ڤێ جارێ ئامادەبوویان هەموویان بۆچوونا مەلای پەسەندکر ب تایبەت موختاری.

هاریکارێ موختاری شوکرللاهی ئیکسەر بووچونا مەلای پەسەندکر، خوە دا بێژی وی ژی دڤیا ڤێ چەندێ بێژیت:

"مە نەڤێت ئەو دناڤ گۆڕستانا گوندێ مە دا بژیت و مە نەڤێت جهێ وێ یێ دوماهیێ دناڤ مریێن مە دا بیت."

موحەمەد عەلی ژی سەرێ خوە هەژاند و دیارکر کو ئەڤ بۆچوونە یا ب دلێ وی ژی یە.

ل دووڤ دا هەر یەکی ژ لایێ خوە ڤە دگوت:

"مە نەڤێت ئەو دناڤ گۆڕستانا مەدا بهێتە ڤەشارتن."

موختاری بەرێ خوە دا مورتەزایێ ڕەمەزانی و پرسیار ژێ کر:

"ئەرێ بۆچوونا تە چیە ل سەر ڤێ چەندێ؟"

وی باش ئاگەهـ ژ پرسیارا موختاری نەبوو، لەوڕا پرسیارا خوە بۆ دووبارە کر:

"مورتەزا، تە دڤێت ئەم کەلەخێ سوڕەیایێ ل کیڤە ڤەشێرین؟"

مورتەزای هەر چ بەرسڤ نەدان، بەلکو سەرێ خوە چەماند و کرە دناڤ چوکێن خوە دا.

پاشی مەلای دووبارە خوە کێشا دناڤ سحبەتێ دا:

"هۆسا دیارە بۆچوونا هەموویان ئەوە ئەم کەلەخێ وێ دناڤ مریێن خوە دا نەڤەشێرین، نوکە بڕیار دێ بۆ هەوە بیت، کا دێ وێ ل کیرا دەرڤەی گوندی ڤەشێرن، چونکی هوون ژ من شارەزاترن ژ بۆ ڤی گوندی، بڕیار دێ بڕیارا هەوە بیت."

زەلامان دەست ب گەنگەشەیێ کر، لێ ئەو نەشیان بگەهنە چ ئەنجامان، پیچەك مابوو ئەو ژبەر گەنگەشەیا خوە یا بێ سەروبەر تووشی شەڕی بن، هەر یەکسەر مەلا هاتە دناڤ سحبەتێ دا و گوت:

"ڕاستە هەوە هەموویان نەڤێت ئەو دناڤ مریێن هەوە دا بهێتە ڤەشارتن، لێ هەوە نەڤێت دناڤ ڕەز و بیساتێن دەرڤەی گوندی ژی دا بهێتە ڤەشارتن چونکی یێن هەوەنە، هەروەسا هەوە نەڤێت کەلەخێ وێ بسوژن ژی، مانە ئەڤە ئەگەرێ گەنگەشەیا هەوەیە؟"

زەلامان هەموویان سەرێن خوە هەژاندن.

مەلای گوت:

"من چارەسەریەکا بۆ ڤێ ئاریشەیێ هەی، لێ ل دەستپێکێ دڤێت هوون هەموو بۆ تشتەکی دگەل من د هەڤڕا بن. ئەرێ ما هوون هەموو نابێژن کو سوڕەیا مانوچەهری ببوو ئەگەرێ پیسکرنا نامیسا مە؟

هەموویان پێکڤە بەرسڤا وی ب پەیڤا بەلێ دا.

— ئەرێ ما هوون نابینن ئەو ژنەکا موسلمان یا نەباش بوو و درەو ل خودایی کربوون؟

دیسان دووبارە هەموویان پێکڤە بەرسڤا وی ب پەیڤا بەلێ دا.

— ئەرێ ما هوون نابینن ئەو ژ ڕێنماییێن پێغەمبەرێ مە یێ خۆشتڤی دەرکەفتبوو؟

— بەلێ، بەلێ، وێ ئەڤ چەندە ژی کربوو."

– باشه پا ئەز دێ بۆچوونا خوە بۆ هەوە بێژم، هەما بلا ئەم ب یەکجاری وێ نەڤەشێرین.

زەلامان ب مەندەهۆشی ڤە تەماشەی هەڤدوو کر.

– نوکە هەوە گوهـ ل من هەبوو، ئەم وێ ناڤەشێرین.

موختاری دستێ خوە ب سەر ڕهێن خو دا ئینا خوارێ و گوت:

"مە گوهـ ل بۆچوونا تە بوو ئەی مەلایێ هێژا، من باوەریەکا تەمام ب بۆچوونێن تە هەیە."

مەلای بەردەوامی دا ئاخفتنێن خوە:

"سوڕەیایێ ژیانەکا ب فێل و سەختە دگەل مە بوراند، وێ خیانەت ل خودایێ مەزن کر هەروەکی کا چەوا خیانەت ل پێغەمبەری و ئیمامێ مە یێ مەزن کری، هەروەسا وێ درەو ل خێزان و هەڤژین و زارۆکێن خوە کر، ژبلی ڤێ چەندێ وێ خیانەت ل گوندێ کوبایێ هەموویێ کر، وێ ژیانا هاشمی ژی ڕەشکر ئەوێ ئەڤە چەند هەیڤەکە هەڤژینا وی وەغەرکری. ئەو وەکی ژنەکا دەهمەن پیس دژیا و وەکی ژنەکا دەهمەنپیس مر ژی، ژبەر هندێ دێ کەلەخێ وێ هاڤێنە ناڤ دارستانێ داکو دەهبە لەشێ وێ خوە بخون."

هەرچەندە موختاری باوەر ژ وان پەیڤان نەدکر یێن هاتینە گوهێن وی، لێ بەری ئەو بۆچوونا خوە دەرببڕیت، زەلامێن دی هەموویان ئاخفتنا مەلای پەسەند کر ژی.

یەك ژ وان زەلامان گوت:

"ئەڤ بڕیارا د بەرژەوەندیا مە هەموویان دایە، بلا ئەو دەهمەن پیسە ژی بچیتە دگەل وان گیانەوەران یێن وەکی وێ، ئەو ناهێتە ڤەشارتن ژبەرکو موسلمانێن باش ب تنێ مافێ ڤەشارتنەکا ژ هەژی هەیە."

مەلای هەردوو دەستێن خوە بلندکرن و گوت:

"هەڤالێن من، ئەم زەلام دێ خوە ژ ڤی کاری دەینە پاش، بلا هندەك ژنێن گوندی ب ڤی کاری ڕابن. ئەگەر هەر یەك ژ ڕەسول و سەعیدی ڤیا هاریکارییا وان بکەن هەتا ژ ئاخێ دئیننە دەرێ بلا وەبکەن، لێ ئەڤا مای هەموو دێ مینتە سەر ملێن ژنان."

زەلامان گوتێ:

"دەستێن تە د خۆش بن، بۆچوونەکا گەلەك د جهێ خوە دابوو."

هەموو ڕابوونەڤە و مال بجهێلا، مەلا و موختار ژی ڕابوونەڤە و بەرەڤ مالا زەهرایێ چوون، مەلای گوتە موختاری:

"نوکە هەڕە بێژە زەهرایێ کا ئەم دێ چ ل کەلەخی وێ کەین چونکی تو ب تنێ دشێی وێ ڕازی بکەی ڤی کاری بکەت، د هەمان دەم دا چ ژن بێی ڕازیبوونا وێ چ کاران ناکەن.

موختاری گوت:

"تو دزانی ئەڤ کارە یێ ب سانەهی نابیت، تو زەهرایێ باش دنیاسی."

- هەلبەت ئەز ژ تە پتر وێ نانیاسیم، چ پێنەڤێت تو دێ شێی ب ڕێکەکێ وێ ڕازی کەی، لێ نوکە هەڕە و گەلەك وەختێ خو ب هەروە نەبورینە.

ل ڤی وەخی، دەنگێ دهۆل و بۆڤێ بلند بوو، هەموویان بەرێ خوە دا تیپا هونەری یا گەڕۆك، مەیمینك یا سواری پێسترکێ دبیت و هندەك یارییێن پەهلەوانی ئەنجامددەت.

مەلا هەر زوو بەرەڤ وان چوو و گوتێ:

"ڤی دەنگی ب ڕاوەستینن، نوکە نە دەمێ هەوەیە، خوە بگرن هەتا گۆڕەپان هەموو ڤالاً دبیت و کەس نەمینتە ل ڤێرێ، پاشی دەست ب چالاکییێن خوە بکەن."

تیپا موزیکێ ڕاوەستیا و مەیمینك ژی ژ سەر پێسترکێ هاتە خوارێ.

پشتی هینگێ، موختار بەرەڤ مالا زەهرایێ چوو و دەرگەهێ وێ قوتا، وی خوە بۆ ڤێ دیداری ئامادەنەکربوو لەوڕا دووبارە هزرێن خوە کرن کا دێ چ بێژتە وێ. ئەڤرۆکە موختاری هەموو کارێن خوە ب ڕێکوپێکی یێن ئەنجامداین ژبەر هندێ ل سەر وی پێدڤیە ڤی کاری ب دوماهی بینیت.

پشتی وی پتر ژ جارەکێ دەرگەهـ قوتای و کەسێ دەرگەهـ نەڤەکری، وی ب خوە دەرگەهـ ڤەکر و چوو د ژوور ڤە، دەمێ وی زەهرا دیتی، گوتێ:

"سلاڤێن خودایی ل سەر تە و هەموو ئەندامێن خێزانا تە بن."

زەهرایێ بەرسڤا وی نەدا، ب تنێ وێ سەرێ خوە هەژاند وەك ئاماژەکرنەك دا بهێت بڕوونتە خوار ل سەر وێ دوشەکێ یا بەری چەند دەمژمێران سوڕەیا ل سەر ڕوونشتی.

زەهرایێ گوت:

"ئەز دزانم کا تو هاتیە چ و بەرسڤا من بۆ تە نەخێرە."

موختار ژ شەرمان دا تێکچوو و گوت:

"تو چ دبێژی زەهرا؟ هێشتا من ئەگەرێ هاتنا خوە بۆ تە دیارنەکریە."

زەهرایێ بەرسڤا وی دا:

"ئەز دزانم تو یێ هاتی بەحسێ چ بکەی، تە دڤێت بەحسێ ڤەشارتنا کەلەخێ سوڕەیایا بەلنگاز بکەی، ب چ ڕەنگان ئەز مایێ خوە د هەوە ناکەم، هەوە زەلامان ئەڤ کارێ دڕندە یێ ئەنجامدای و هوون ب خوە دێ کارێ خوە ب دوماهی ئینن ژی، خوە ژنەك هاریکارییا هەوە ناکەت."

وی د دلێ خوە دا گوت:

"ئەڤ چەندە دەستپێکەکا باش نەبوو."

پاشی وی کیسکێ تووتنێ ژ بەریکا خوە ئینا دەرێ و جگارەك بۆ خوە تێکر و گوت:

"بەس ئەز ب دروستاهی ژبەر ڤی کاری نەهاتیمە."

وی زانی دڤێت ئەو پتر هشیاری ئاخفتنێن خوە بیت بەری زەهرا ژ وی تۆڕەببیت و ژ مالا خوە بکەتە دەرێ.

- زەهرا خانم، ئەز یێ هاتیمە ڤێرێ داکو تە ل سەر بڕیارا باژێرڤانیا گوندی ئاگەهدار بکەم.
- ئانکو مەرەما تە ئەوە تو هاتیە بڕیارا وی کەسێ بێخێر بۆ من بێژی یێ کەسایەتیا خوە یا پیس ل بن جلێن زەلامێن ئایینی ڤەشارتی، بهێلە بۆ تە تشتەکی بێژم، ئەڤە ژ مێژە وەرە ئەز و تو هەڤالێن یەکین، ئەز دزانم تو ب خوە نەیێ ڕازی ل سەر وی تشتێ تو پێ هاتیە ڕاسپاردن دا بێژیە من، تو باش دزانی ژی ئەز دێ داخوازیێن هەموویێ ڕەتکەم، مانە هۆسایە."

ل ڤێرێ بۆ موختاری دیار بوو کارێ وی دەرکەفت گەلەك ب زەحمەتتر ژ پێشبینیا وی دکری، لێ وی ئاخفتنا وێ بڕی و گوتێ:

"بۆ من نەیا گرنگە کا تو دێ چ بێژی، مە هەموویان پێکڤە دەنگێ خوە یێ دایی و گەهشتینە بڕیارەکێ و ل سەر من یا پێدڤیە ئەز ڤێ بڕیارێ بجهبینم."

- باشە پا تو هاتیە مالا من چ؟ ئەرێ بۆچوونێن ژنان ژ نوکە وی ڤە بهایێ خوە د گوندی دا هەیە، یان ژی ل سالێن بەرێ بۆچوونێن وان بهایێ خوە ل دەڤ تە هەبوو.

- ئەز یێ هاتیم دا بێژمە تە، بۆ بابەتێ ڤەشارتنا سوڕەیایێ مە ئاریشەك یا هەی، كەسێ نەڤێت ئەم وێ ل گۆڕستانا گوندی ڤەشێرین.
- ڤێجا تو هاتیە پرسیارا بۆچوونا من بكەی؟ تو دزانی ئەز دێ بێژمە تە من دڤێت ئەم وێ ب ڕەخ دایكا وی ڤە دناڤ گۆڕستانێ دا ڤەشێرین.
- ئاریشە نە جهێ ڤەشارتنێ یە كا ل كیڤە بیت، مەلای حەسەن یێ دبێژیت پێدڤیە ئەم هەر وێ نەڤەشێرین ب یەكجاری.

ب گوتنا ڤان ئاخفتنان، زەهرا وەكی دینان لێ هات و ناڤچاڤێن وێ یێن قورمچی پتر تێكچوون و گوت:

"تە چ گوت؟ تو چەوا دوێری ئاخفتنەكا هۆسا ل دەڤ من بێژی؟ ئەو كیە وێرەكیێ ددەتە خوە و دبێژیت ئەم وی ب یەكجاری ناڤەشێرین؟"

- شەریعەتێ خودایی یا حەڕامكری هەر كەسێ بهێتە ڕەجماندن، نابیت بهێتە ڤەشارتن، مەلا حەسەنی ئەڤ چەندە یا گوتی.
- ڤێجا ئەو چ دزانیت؟ ئەرێ ئەوێن بەری نوكە ژی هاتینە ڕەجماندن، كەس ژ وان نەهاتیە ڤەشارتن؟
- ئەز نزانم، لێ مەلا دبێژیت ئەو كەسێن ژ ڕێكا خودایی لادای، نابیت دگەل وان كەسان بهێنە ڤەشارتن یێن ژیانەكا سەربلندی ژیاین.

گەنگەشەیەکا درێژ دناڤبەرا ڤان هەردوو هەڤالێن کەڤن دا هاتەکرن و هەر یەکی دڤیا بۆچوونا خوە ل سەر یێ دی زاڵ کەت، لێ ل دوماهیێ ئیبراهیم ژ مالا زەهراییێ دەرکەفت و شیا بگەهیتە ئارمانجا خوە. بەری ب دوماهی هاتنا شەڤێ و هەلاتنا ڕۆژەکا نوو، هندەك ژن دێ کەلەخێ وێ هەلگرن و بەنە ژ دەرڤەی گوندێ کوباییێ.

سەعید و ڕەسوٚل هاتنە ڕاسپاردن ژ بۆ بلندکرنا کەلەخێ وێ د چاڵێ دا، سەرەڕای نخافتنا کەلەخێ وێ ب پارچەیەکا قوماشی، لێ ل وی دەمی هژمارەکا مەزن یاٚ مێش و پێشیان دادابوو سەر لەشێ وێ و بێهنەکا زێدە نەخۆش ژێ دهات تا وی ڕادەی سەیێن گوندی ب دەنگەکێ بلند و ترس درەوین.

دەمێ لەشێ سوڕەیاییێ ژ زیندانا ئاخێ ئینایە دەرێ، سەرێ وێ ل سەر ڕەخەکێ وێ مابوو و ژبەر شکەستنا قەرقودێ سەرێ وێ، پیچەك مابوو ژ کەلەخێ وێ ڤەبیت لێ پشتی وان پیچەکێ ئەو زڤڕاندی، هەما ب یەکجاری سەرێ وێ ژ کەلەخێ وێ ڤەبوو، ژبەر هندێ ڤان هەردوو زەلامان کارێ خوە ڕاوەستاند و بزاڤکر پتر ب هشیاریڤی کاری ئەنجام بدەن.

دەمێ کووراتیا چاڵێ گەهشتیە وی ڕادەی هەردوو زەلام بشێن بچنە تێدا، وان لەشێ وێ یێ بێ سەر ئەوێ هێشتا ب جلێن بووکینیێ خەملاندی ئینا دەرێ.

مەلای گوتە وان:

"ئەز سوپاسیا هەوە دکەم ڤی کارێ هەوە ئەنجامدایی، نوکە هەڕن سەرێن خوە بشوون، خودا دێ خەلاتێ هەوە ل سەر ڤی کاری دەتە هەوە."

سەعید و ڕەسول بەری بچنە سەر ڕووباری دا خوە بشوون، مەلای داخوازا ژێ کر کەلەخێ سوڕەیایێ ب پارچەیەکا قوماشی ب نخڤێن بەری ژن بهێن کەلەخێ وێ ببەن.

پشتی کەلەخێ وێ هاتیە نخافتن ئەو ژ وێرێ چوون، دیسان هندەك سەیێن هار خوە نێزیکی وێ کر و سەیەکی ب کێلبێن خوە دەڤێ خوە هاڤێتە پارچەیا قوماشی و دووبارە کەلەخێ وێ یێ تێکچووی دیار بوو، لێ باش بوو هەر زوو ژن گەهشتنێ و هندەك بەر تێوەرکرن و ژ وێرێ دوورکرن.

زەهرایێ تەماشی ڤی دیمەنێ دلتەزین کر، پیچەك مابوو دلێ وێ ڕابیت لەوڕا کلینسەك دا بەر دەڤێ خوە و پاشی هندەك ڕێنما بۆ ژنان گوتن کا دێ چ کەن. وان بەتەنیەکا مەزن ل سەر ئەردی ڕائێخست و پاشی کەلەخێ سوڕەیایێ کرە دناڤ دا و باش وەرپێچا و ل دووڤ دا کەلەخێ وێ کرە د عەرەبانەکێ دا و برە ژ دەرڤەی گوندی و سەیێن هار ژی ل دووڤ شوونوارێن وان دچوون.

حەجی ئیبراهیم و سێ زەلامێن دی یێن گوندی ب کارێ پڕکرنا وێ چالا ئاخێ ڕابوون و چ شوینوارێن خوینێ ژی نەهێلانە ل وێرێ، ل دووڤ دا سەعیدی عەرەبانەکا ئاخێ یا تژی ئینا وێرێ و کرە سەر وی جهی داکو چ شوونوارێن وێ چالێ نەمینن.

ل وی دەمی، دنیا ببوو شەڤ و کەس نەمابوو ژ دەرڤە، تیپا هونەری یا گەڕۆك ژی کەلوپەلێن خوە دانابوون و چاڤەڕێی خەلکی بوون بهێنە ژ دەرڤە داکو ئەو دەست ب یاریێن خوە بکەن.

هەر ل ڤی دەمی، ب دووراتیا نیف کیلۆمەترێ ژ گوندی ل لایێ ڕووباری، ئەو ژنێن کەلەخێ سوڕەیایێ بریە ژ دەرڤەی گوندی پیچەکێ ڕاوەستیان دا بێهنا خوە ڤەدەن، زەهرا گەلەك وەستیا، دا بێژی ئەو پیراتیا ب سەر لەشێ وێ دا هاتی د ماوەیێ بیست سالێن بوری دا ئەو پیر نەببوو و لەشێ وێ ژی ژ بەرێ بێهێزتر لێ هاتبوو.

دوهی ل ڤی دەمی وێ سوڕەیایێ دابوو بەر سینگێ خوە ئەو ژی پشتی کو هندەك فێقی ژ مالا خوە بۆ وێ ئینایی، لێ نوکە و پشتی بورینا بیست و چوار دەمژمێران ب تنێ، ئەو یا کەلەخێ وێ دهەلگریت و دبەتە ژ دەرڤەی گوندی.

ژنەکێ پرسیار ژ زەهرایێ کر:

"ئەرێ چەند مایە ئەم بگەهینە وی جهێ سوڕەیایێ بدانینێ؟"

زەهرایێ کو دەستێ وێ ب عەرەبانکێ ڤەبوو نەدهێلا کەلەخ ژێ بکەڤیت چونکی ئەرد گەلەك یێ ڕك و نەخۆش بوو، بەرسڤا وێ دا:

"گەلەك نەمایە، ب تنێ ئەڤ چەپە یا مای و دێ گەهینە وی جهی، ل بەر ڕووباری پارچەیەکا بچووك یا ئەردی یا هەی سوڕەیایێ گەلەك حەز ژێ دکر، ئەم دێ کەلەخێ وێ دانینە وێرێ."

هەڤالێن وێ ب ڤێ پێشنیارا وێ ڕازی بوون و بەردەوامی دا پاڵدانا عەرەبانێ، سەیێن هار ژی بەلاً خوە ژێڤە ناکەن و هەر یێن ل دووڤ شوونوارێن وان دچن.

ل دوماهیێ ئەو گەهشتنە وی جهێ بەری نوکە وان دەستنیشانکری، ژنەکێ دوو بەرێن مەزن دانانە بەر عەرەبانێ داکو نەکەڤیت، پاشی وان لەشێ وێ یێ دناڤ بەتەنیێ دا هەلگرت و ب دووراتیا نەهـ بۆ دەهـ مەتران ژ رێکێ دوورکر و دانا دناڤ ژێهەلیەکێ سەر رووباری دناڤبەرا دوو دارێن ئاسێ یێن بچووك دا.

زەهرایێ باش کەلەخێ وێ نخافت و هەردوو سەرێن وی ب بەنکەکی ڤە گرێدان داکو چ مێشومور نەچنە دناڤ دا و کۆمەکا بەرێن مەزن ژی دانا دورماندوری وێ و هندەك بەلگێن دارا دانانە سەر، پشتی ژنان ماوەیەکێ کورت بێهنا خوە ل وێرێ ڤەدای، دووبارە ئەو زڤرینە گوندی و عەرەبانکا خوە یا ڤالاً و خویناوی دگەل خوە زڤراند دەمێ ئەو نێزیکی گوندی بووین، دەنگێ دهۆل و بۆقێن تیپا هونەری یا گەرۆك هاتە گوهێن وان.

دەمێ زەهرا گەهشتیە گورەپانا گوندی، ئەو مەندەهۆش ما ژبەر وی دیمەنێ نوکە ب چاڤێن خوە دبینیت، ل هەمان جهێ بەری نوکە سورەیا لێ هاتیە رەجماندن، نوکە خەلك هەموو یێ ل وێرێ خرڤەبووین و سەما و دەهواتێ دکەن، ئەو لێبۆك ژی یێن یاریێن ئاگری و شانۆگەریان بۆ وان پێشکێش دکەن.

زەهرا وەکی پەیکەرەکێ رەق راوەستیا و وێ قەت باوەر ژ وی دیمەنی نەدکر یێ چاڤێن وێ دیتی، چەند دەمژمێرێن کورت ل سەر مرنا سورەیایێ ڤە نەبورینە لێ ئەڤ خەلکە یێ دەست ب دەهوات و سەمایێ دکەن دێ بێژی ئەو یێ د جەژنا چوارشەمبا سۆر دا.

زەهرا دناڤ وێ کۆما خەلکی دا شیا سەعیدی و ڕەسولی بنیاسیت کو وان هاریکارییا ژنان کربوو هەتا کەلەخ ژ چالاً ئاخێ ئینایە دەرێ، هەروەسا مەهدییێ گوشتفرۆش ژی یێ ب ڕەخ مەسعودێ سەتڕاش ڤە ڕوونشتیە و یێ تەپان لێ ددەت. پیچەکێ دوور ژ وان، هەردوو هاریکارێن موختاری یێ سترانان دبێژن و سەمایێ دکەن. شڤانێ پەزی "یداللە" و کوڕێ وی یێن ل ڕەخەکی و دەنگێ کەنیا وان یێ بلند دبیت زێدەباری کەریمی و ئەسغەری و ماجدی و  موشن و ڕەحمەتوللاهی و گەلەك زەلامێن دی، ب ل لایەکێ دی یێ وێ گوڕەپانێ، حسێن و حەسەن ژی د ڕوونشتینە و یێ شتیەکی کەر دکەن.

ل دوماهییێ چاڤێ زەهرایێ ب مەلا حەسەنی و حەجی ئیبراهیمی کەفت کو ل بەر دەرگەهێ دوکانا نانپێژی د ڕاوەستیایی بوون و مورتەزاییێ ڕەمەزانی ژی ب ڕەخ وان ڤە بوو و هۆسا دیارە گەلەك خەوا وی دهات. ڤان هەردوو زەلامان ئاخفتنا خوە بڕی دەمێ ژن گەهشتینە دەڤ وان، لێ زەهرا دبەر وان ڕا بوری و دگەل نەئاخفت.

زەهرا چوو مالا خوە و دەرگەهێ خوە ل پشت خوە گرت، هەر یەك ژ ژنێن دی ژی چوونە مالێن خوە و پشکداری دگەل خەلکی د ئاهەنگ و سەما و یارییێن وان دا نەکر.

ل ڕۆژا دی سپێدی زوو، زەهرا ژ مال دەرکەفت و ب دزیکی ڤە ژناڤ گوندی دەرکەفت بێی کو یەك وێ ببینیت. دناڤ گوندی دا هێشتا دووکێلا ئاگرێ شڤێدی یێ تیپا هونەری یا بلند دبیتە بەر ئاسمانی، ئەو هەر چوار لێبۆك ژی ب ڕەخ ترۆمبێلێن خوە ڤە یێن نڤستین.

زەهرا نێزیکی نیڤ کیلۆمەتری ژ گوندی دوور کەفت و پاشی د ڕێکەکا کورت دا دناڤ دارستانێ ڕا بوری هەتا گەهشتیە سەر لێڤێن ڕووباری کو شڤێدی وان کەلەخێ سوڕەیایێ دانابوو ڤێرێ، دەمێ ئەو نێزیك بووی وێ ڤێژیەکا حێل ڤەدا.

ب دووراتیا چەند پێنگاڤەکان، سێ چوار سەیێن هار یێن د خەو چووین و زکێ وان یێ تژی بووی و دەڤ و دفنێن وان ب خوینێ یێن سۆر بووین ژبەر خوارنا لەشێ سوڕەیایێ، ژ کەلەخێ سوڕەیایێ ژبلی هندەك هەستیکان و پرتێن بەتەنیێ، چ تشت نەمایە و وان هەموو یێ خوارێ. پیچەکێ وی ڤەتر بەرمایکێن سەرێ وێ یێن ماین.

زەهرا چوو بن دارەکێ و ڕوونشتە خوارێ چونکی ژبەر وێ ڕێکا درێژ بێهنا وێ گەلەك تەنگ ببوو. نێزیکی دەمژمێرەکێ ما ل وێرێ هەتا هێز هاتیە لەشێ وێ، ل دووڤ دا  ڕابووڤە و بەرەکێ مەزن د وان سەیان وەرکر داکو ژ وێرێ بچن.

پاشی زەهرایێ دەست ب کۆلینا چالەکا بچووك یا ئەردی کر کو ئاخا وێ یا تەڕ و نازك بوو، پشتی وێ چالەکا گونجایی کۆلای، هەستیکێن سوڕەیایێ یەك یەکە هەلگرتن و برنە سەر ڕووباری شووشتن و پاشی ئینان کرنە د وێ چالێ دا و ئاخ کرە سەر و ب هندەك بەلگ و قورمێن داران نخافتن، پاشی ئەو هێلا ب هیڤیا خودایی ڤە و دەست ب گریێ کر.

**دوماهیك**

# پرۆفایلێ وەرگێڕی

## دیان جەمیل ساڵح

- ل باژێرێ دهۆکێ هاتیە سەر دونیایێ
- دەرچوویێ کۆلیژا زانست پشکا بایۆلۆژی ل زانکۆیا دهۆکێ سالا 2010
- هەلگرێ باوەرنامەیا ماستەرێ یە د زانستێ بۆماوەزانیا خانەیی دا ل سالا 2015
- مامۆستایە ل زانکۆیا دهۆك، کۆلیژا پزیشکی هەر ژ سالا 2012
- ئەندامێ کارا یێ سەندیکا بایۆلۆژییێن کوردستانێ یە/ لقێ دهۆك
- ئەندامێ کارا یێ سەندیکا ڕۆژنامەڤانێن کوردستانێ یە/ لقێ دهۆك
- سەرپەرشتێ بەرپەڕێن زانستی و ساخلەمی بوویە ل چەندین گۆڤار و ڕۆژنامەیان تایبەت گوڤارێن کوردزووم و پێرومەگەزین.
- کارکریە د کار و چالاکیێن چەندین ڕێکخراوێن نە حکومی دا
- پشکدار بوویە د چەندین کۆڕ و سمینار و وۆرك شۆپێن زانستی و ڕەوشەنبیری و ئەدەبی دا کریە، هندەك ژ وان ژی ژ پێشکێشکرنا نڤیسەری ب خوە بووینە
- ڕابوویە ب ڕێڤەبرنا چەندین پۆستێن ڕۆژنامەڤانی مینا "ڕێڤەبەرێ نڤیسینێ و دەستەکا نڤیسەران، هتد).
- بۆ ماوەیەکی ب وەکالەت ڕێڤەبەرێ ڕێڤەبەریا تەندروستی و سەلامەتی یا سەر ب زانکۆیا هۆکێ ڤەبوویە.

## بەرهەمێن چاپکری و نەچاپکری:

### 1- وەرگێڕانا پەرتووکێن زانستی ژ زمانێ ئینگلیزی بۆ زمانێ کوردی

| ناڤێ پەرتووکێ | سالا وەرگێڕانێ | سالا چاپکرنێ |
|---|---|---|
| 1. بایۆلۆژیا گەردی و خانەیی | 2010 | 2012 |
| 2. مایکرۆبایۆلۆژی | 2010 | 2012 |
| 3. فرمانزانی و کەلاشتنا لەشێ مرۆڤی | 2013 | 2014 |
| 4. بۆماوەزانی | 2013 | 2014 |
| 5. مشەخۆرزانیا پزیشکی | 2013 | 2014 |
| 6. ناڤرێژزانی | 2013 | 2014 |

### 2- وەرگێڕانا پەرتووکێن زانستی و چیرۆکان یێن زارۆکان:

| ناڤێ پەرتووکێ | سالا وەرگێڕانێ | سالا چاپکرنێ |
|---|---|---|
| 7. گەریانەك بۆ ناڤ لەشێ مرۆڤی | 2012 | ——— |
| 8. بۆچی گیانەوەر بەرەڤ نەمانێ دچن؟ | 2012 | ——— |
| 9. سەیروسەمەرێن جیهانا گیانەوەران | 2012 | ——— |
| 10. دیاریا سەرێ سالێ | 2013 | 2013 |
| 11. هیڤیا ماسیێ | 2013 | 2013 |
| 12. بۆچی بۆبی نەوێریت بفڕیت؟ | 2013 | 2013 |
| 13. ڕەوشتێ سلاڤێ | 2016 | ——— |
| 14. ڕەوشتێ پێکڤە کارکرنێ | 2016 | ——— |
| 15. ڕەوشتێ کرنا یاریان | 2016 | ——— |
| 16. ڕەوشتێ سوپاسیکرنێ | 2016 | ——— |
| 17. زەحمەت نەبیت | 2016 | ——— |

3- ئامادەكرن و وەرگێڕانا پەرتووكێن گشتی:

| ناڤێ پەرتووكێ | سالا وەرگێڕانێ | سالا چاپكرنێ |
| --- | --- | --- |
| 18. 100 كاريگەرترين كەسايەتی د ديرۆكێ دا و ل پێشيا وان محمد (س.خ) | 2015 | ــــــــ |
| 19. سێكس د چوارچۆڤەيەكێ ڕەوشەنبيری دا | 2016 | 2016 |
| 20. ڤێ بەڤێ بخۆ ! | 2016 | 2016 |
| 21. ڕەجماندنا سوڕەيايێ (ڕۆمان) | 2016 | 2016 |
| 22. ئەو مريشكا دڤيايی بفڕيت (ڕۆمان) | 2016 | ــــــــ |
| 23. ڕۆژانێن گوهدرێژەكی (فەلسەفە) | 2016 | ــــــــ |

"وەکی کەسێن دۆری نەبە
یێن هزر دکەن دێ پیلانێن خۆ ب گوتنێن
خۆدێ ڤەشێرن"

حافزێ شیرازی